
یەکەمین گۆڤاری کارگێڕیو گەشەپێدانی مرۆیی لە کوردستاندا
لە پێناو گەلێکی خاوەن بڕیاردا
بڕیار
مانگنامەیەکی تایبەتە بە کارگێڕیو گەشەپێدانی مرۆیی
سالی حەوتەم
77
تشرینی دووەمی ٢٠١٤
زۆری بەبێ زۆر!
مرۆڤدۆستی!
چیتر نامترسێنێ!
قۆناغی زانکۆ وەرزێك بۆ چاندنی گوڵەباخ!
ڕێنمایی، بەزمانی کوردی بنووسن!
خانووی لمینو دروستکردنی نیشتیمان

# No: 77


**خاوەنی ئیمتیاز**

ئەندازیار:

مەسعود تـاهیر ڕۆژبەیانی

**سەرنووسەر**

عادل محەممەد شێخانی

sarnosar@yahoo.com

**بەڕێوەبەری نووسین**

بەرزان ئەبوبەکر

**دەستەی نووسەران**

ئەسکەندەر ڕەحیم

بێگـەرد فـــارس

زاهیـــر زانـــا

گوڵان حەمەئەمین

محەممەد مێرگەیی

محمد هاشم محمد

وەهـاب حەسـیب

یەحیـــا محەممەد

**ڕاوێژکاری یاسایی**

پارێزەر:- ئازاد محێدین

**بەشی هونەری و دیزاین**

پشتیوان عبدالرحمن

**تایپ**

کلسوم جەلال

**ناونیشانی گۆڤار**

سلێمانی - شەقامی سالم -تەلاری جەمالی حاجی عەلی-

نهۆمی چوارەم- یەکەی (٤٠١) نزیك پردی خەسرەو خاڵ

٠٧٤٨٠١١٢٧٨٧ - ٠٧٧٠٢١٧٨٦٨٢

هەولێر

٠٧٥٠٤٤٦٣٢٣٠ - ٠٧٥٠٠٥٢٥٣٠٣٥

E-mail: bryarmagazin@gmail.com


E-mail: bryarmagazin@gmail.com

bryarmagazine


دابەشکردن: کۆمپانیای پەیك

07708649210

چاپ: کۆمپانیای پیرەمێرد


نرخ 2500 دینار

# بڕیار

مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕیو گەشەپێدانی مرۆیی

ساڵی حەوتەم - ژمارە 77 -تشرینی دووەمی 2014






















## کارگێڕیو بازاڕسازی

# قۆناغی زانکۆ وەرزێك بۆ چاندنی گوڵەباخ!

قۆناغێکی نوێ، هاوکات ژیانێکی نوێ لە چاوەڕوانیتایە، ژیانێك جیاواز لە قۆناغەکانی پێشوو، لە هەموو ڕوویەکەوە.

ژینگەیەکی کراوەو فراوان، خوێندنێکی جیاواز، شێوازێکی نوێو پەیوەندی نوێو تەمەنێکی جیاوازو حەزوو ئارەزوو ڕوانینێکی نوێ!

هاوکات بۆ هەندێك گۆڕانکارییەکی بنەڕەتی، لە شوێنو زێدی هەمیشەییان ڕوودەداتو بۆ یەکەمجار شارو وڵاتوماڵی خۆیان جێدەهێڵنو لە شوێنێکی نوێ جێگیر دەبن، گۆڕانکاری لەسەرجەم پەیوەندییەکانیاندا ڕوودەدات!

هاوەڵی نوێ، مامۆستای نوێ، ژیانی بەشی ناوخۆییو پشت بەخۆبەستنو وەستان لەسەر پێی خۆو هەستکردن بە بەرپرسیارێتی تەواو، لێرەوە دەست پێدەکات.

ئیدی خۆت بەرپرسیاری لە خواردنو خەوتنو جلوبەرگو سەرجەم پێداویستییەکانی ڕۆژ!

ئیدی دەبێت کاتەکانت ڕێکبخەیت، گەر بتەوێت خوێندکارێکی سەرکەوتوو بیت، دەبێت ژیانت بەرنامەڕێژو هەنگاوەکانت پلانساز کردبێت!

ئەم قۆناغە بۆ کەسێك بە هەستیارییو وریاییەوە بۆی بڕوانێتو بزانێت چۆن چوار ساڵی تەمەنی زانکۆی بەسەردەبات، قۆناغی دروستبوونو کامڵبوونی کەسایەتیو هێدی هێدی بنیاتنانی ئایدیاو ڕوانینی ڕاستەقینەیە بۆ ژیانو دەوروبەر.

لێرەدا بابەتگەلێك دەوروژێن، کە پێشتر لە قۆناغی ئامادەیی وەکو خەونێك، یان بابەتێکی سادە هاتۆتە پێش، ئەمڕۆ بیر لە پراکتیزەکردنو هەنگاوی جیددی دەکرێتەوە.

خۆشەویستیو پەیوەندی سۆزدارییو پاشان هاوسەرگیریو بیرکردنەوە لە ژیانێکی نوێو قۆناغی دوای زانکۆ، باسو خواسو بابەتی گرنگی هەموو خوێندکارێکی زانکۆیە.

بەڵام زۆر گرنگە، بتوانین هۆشیارانەو زۆر بە وریاییو زیرەکییەوە، مامەڵەی لەگەڵدا بکەین!

ئێمە هاتووین بۆ زانکۆ، بۆ کۆمەڵێك ئامانجی مەزن، نەك لەگەڵ هاتنە نێو دالانی زانکۆ، یەکەم کارمان گەڕانبێت بە شوێن ئەو کەسەی کە دەیکەیەینە لانەی خۆشەویستیو سۆزداریی خۆمان!

دڵنیابن، خۆشەویستی لە یەکەم نیگاوە، هەمیشە شکستی هێناوەو ئەنجامێکی دروستی نەبووە!

بەداخەوە ئازیزان، سەرقاڵبوونمان بە وەها کارێکو فەرامۆشکردنی ئامانجی سەرەکیمان بۆ زانکۆ، لادانێکی خەتەرناکە، لە ڕێگای ڕاستەقینەی ژیانو مامەڵەی دروست، لەگەڵ قۆناغی نوێدا!

دەکرێت بڵێین: ئەی دۆزینەوەی هاوسەری داهاتوو، هاودەمی ژیانو لانەی ئەوینو خۆشەویستی بە گرنگ نازانی؟!

بەڵێ گرنگەو زۆریش گرنگە، بەرنامەدانانو بیرکردنەوەو ئامادەکاری بۆ ئەو کارە، زۆر بە پێویست دەزانم، بەڵام خۆ ئەو کارە تەنها لە سنوری زانکۆدا ناکرێت، هاوکات تاکە پێوەریش تەنها بینینی ڕووخسارو ڕووکەشو جوانی دەرەوە نییە!

سەرەتا لە زانکۆدا بە ناخی خۆتا ڕۆبچۆ، لە مانای ژیان تێبگەو بە خۆشەویستیو ئەوینی ڕاستەقینە ئاشنابە، گرنگی بە مرۆڤبوونو دۆزینەوەی مرۆڤ بدە، نەك تەنها کەسێك بۆ بەتاڵکردنەوەی سۆزداری خۆت!

زانکۆ گۆڕەپانێکی گەورەیە، نەك تەنها بۆ خوێندنی ئەکادیمیو کۆکردنەوەی زانیاریی، بەڵکو بۆ فێربوونی هونەرەکانی ژیانو شارەزاییو بەهرەی نوێو چاوهەڵهێنان بە جوانییەکانو ئاسۆ نوێیەکانی ژیاندا!

زانکۆ جێگایەکە بۆ دۆزینەوەی هاوڕێی نوێو کتێبی نوێو ئامانجی نوێو پەرەپێدان بە خودو هەموو ڕەهەندەکانی ژیان.

زانکۆ کێڵگەیەکەو تەمەنی ئێوەش وەرزێکە بۆ چاندنی گوڵەباخ، تا لە ئایندەدا، لە ژێر گوڵو گوڵاویدا پشوو بدەنو ژیانێکی ئاسودە بەسەربەرن!

لەگەڵ ئەوەشدا وریای دڕكو داڵی هاوڕێی خراپو ئەو کەسانە بن، کە گورگن لە پێستی مەڕدا، بە هەڵەخزاونەتە نێو مرۆڤەکانو بە مرۆڤ ناوزەد دەکرێن!

ئەمە تەنها ئاگاداریو وریابوونە، ئەگینا سڵ لە هیچ مەکەنەوەو پشت بە خودا، سەرکەوتوو دەبن!



# کارگێڕی

## بەگـــوفتار

سێ کەس تەنها لە سێ کاتدا دەناسرێن:- ئازا لە کاتی شەڕدا، بەخشندە لە کاتی پێویستیدا، نەرمونیان لە کاتی توڕەبووندا!

لوقمانی حەکیم

سوود لە لاوێتیت وەربگرە، پێش ئەوەی پیربیت، سوود لە دەوڵەمەندیت وەربگرە، پێش ئەوەی هەژار ببیت، سوود لە تەندروستیت وەربگرە، پێش ئەوەی نەخۆش بکەویت.
پێشەوای مرۆڤایەتی (سەلامی خودای لێبێت).

پێشکەوتن و شارستانییەت، لە ئەنجامی هەوڵ و ماندووبوونی بلیمەتەکانەوە هاتوونەتە دی، نەک لە ئەنجامی زۆربلێیی زۆرینەوە!

هتلـــەر

ئێمە دژایەتیی مرۆڤەکان ناکەین، بەڵکو دژایەتیی هەڵەکانیان دەکەین!

غاندی

زانست و زانیاری، بەبێ کاروکردەوە، وەکو کەشتی وایە، بەبێ کەشتییەوان!

جۆرج برناردشۆ

# هەمیشە ڕێگایەك هەیە، بۆ گەیشتن بە ئامانج!

کابرایەکی کرێچی، بە ئاواتەوە بوو، کە بتوانێ کرێی خانووەکەی کەم بکاتەوە، بەڵام دەیزانی کە خاوەنی باڵەخانەکە، کەسێکی سەرسەختو کەللەڕەقەو قسەی لەگەڵدا ناکرێت، ویستی نامەیەکی بۆ بنووسێو ئاگاداری بکاتەوە، کە بە تەواوبوونی ماوەکەی، خانووەکە چۆڵ دەکات، هەرچەندە زۆری حەزدەکرد، کە بیتوانیایە کرێکەی پێ کەم بکاتەوە.

کابرا پێی وابوو، کە هیوایەك بەدی ناکرێت، لە هەوڵدان لەگەڵ خاوەنی باڵەخانەکەدا، چونکە پێشتر بیستبووی کە کەسانی تریش هەوڵیان داوەو هەوڵدانەکەیان بێ سوود بووە!

ئەوان پێیان گوتبوو، کە مامەڵەکردن لەگەڵ ئەم کابرایەدا، زۆر ئەستەمە!

کابرا دەڵێت: لەگەڵ ئەوەشدا بە خۆم گوت، دەبێ حەتمەن ڕێگایەکی تر هەبێت، بمانگەیەنێتە ئەنجامێکی باشتر.

هەر لەبەرئەوە، چووم بۆ لایو سەرەتا بە گەرمی دەستخۆشی بەڕێوەبردنی ئاپارتمانەکەم لێکردو پێم گوت: من زۆر حەزم دەکرد، ئەگەر لەبەر بەرزیی کرێ نەبایە، لێرە بمامایەتەوە. بەڵام من ئەم کرێیەم پێ نادرێ!!

خاوەنی ئاپارتمانەکە، بەم قسانە سەرسام بوو، لە خۆشیاندا گوتی: وای لەم بەختەوەرییە، کە من کرێچییەکی وەکو تۆ دەبینم، کە لێم ڕازییەو حەز بە بەردەوامبوون لێرە دەکات!

هەر لەوێدا، بێئەوەی من قسە بکەم، پێشنیاری دابەزاندنی کرێکەی کردو سەرپشکی کردم، لە دیاریکردنی ئەو پارەیەی کە دەتوانم، مانگانە وەکو کرێ بیدەمو یەکسەریش پەسەندی کرد!

بەڵام ئەگەر هەوڵی کەمکردنەوەی کرێم بکردایە، بە شێوازی کەسانی پێش خۆم، بێگومان سەرەنجامم هەروەکو ئەوان شکست دەبوو، بەڵام من، شێوازێکی نوێم بەکارهێنا!

## لەم چیرۆکەوە فێردەبین:-

١. هەر شوێنەو ڕێگایەکی هەیەو هەردڵەو دەرگایەكو کلیلێك!

٢. گرفت نییە، چارەسەری نەبێت.. کێشە نییە چارەنەکرێت!!

٣. بەکارهێنانی ڕێگایەك کە تاقیکراوەتەوە، ئەنجامی نوێی لێ پەیدا نابێت.

٤. بیربکەرەوە تا دەگەی بە ڕێگە چارەی نوێو گونجاو.

٥. هێمنانە ڕووبەڕووی کێشەکان ببەرەوە، ئاگر بە ئاو خامۆش دەبێت، نەك بە نەوت.

٦. گەیاندنی پەیام بەشێوەیەکی درووست، کارێکی گرنگەو پێویستە فێری ببین.

٧. هەرکاتێك توانیمان لە دڵی بەرامبەردا، جێگای خۆمان بکەینەوە، ئیدی هەموو کارەکان، ئاسان دەبن!



# تەنها بۆ سەرکردەکان

ئەگەر لە جەنگدا پێشتان کەوتم، دوام بکەون.. ئەگەر پاشەکشەم کرد، بمکوژن..
ئەگەر مردیشم، تۆڵەم بستێنن.
لاروشجاکلان

چارەنووسی هەموو گەلێك، پەیوەستە بە
لاوەکانییەوە.. گۆتە

ئەو کەسەی شەرەفی لەدەست بدات، شتێکی دیکە
نامێنێت، لە دەستی بدات..
یوبلیلیوس سیروس

ڕۆژێك ژیان وەکو شێر، لە سەد ساڵ ژیان وەکو مەڕ،
چاکترە. رامبۆ

هیچ بەختەوەرییەك نییە، هاوتای
ئاسوودەیی ویژدان بێت.
نیین باجە

هەر کەس قوتابخانەیەك بکاتەوە، زیندانێك
دادەخات. ناپلیۆن پۆناپارت

تەمەن بە هەستو ژیرییە، نەك
بەساڵ. کورتس



زانا عبدالرحمن

# له یەکەم چاوپێکەوتندا، بە سەنگینی دەربکەوە!

ڕەنگە بپرسیت: چۆن دەتوانیت سەنگین ببیت، یان چۆن خۆم سەنگین بکەم، چی بکەم تا ببمە کەسێکی سەنگین، بەچاوی گەورەییو ڕێزەوە سەیر بکرێم؟

ئەگەر بمانەوێت، وەکو کەسێکی سەنگین دەربکەوین، پێویستمان بە هەوڵدانە، ڕووبەڕووی ناخۆشیی زۆریش دەبینەوە، بەڵام ئەگەر متمانەی تەواومان بەخۆمان هەبێت، ئەوا دەتوانین لەسەری بەردەوام بین.

ئەوەشمان بیرنەچێت، ئەگەر بەرگەی ناخۆشییەکانمان گرتو بووین بە کەسێکی خاوەن سەنگ، ڕێزو پلەوپایەی تایبەتمان دەبێت لە کۆمەڵگەدا.

دەتوانین چۆنییەتیی خۆسەنگینکردن، کورت بکەینەوە لە دوو خاڵی سەرەکیدا:-

١- لە یەکەم چاوپێکەوتندا، بە سەنگینی دەربکەوە.

٢- ئەگەر نەتتوانی لە یەکەم چاوپێکەوتندا، بە سەنگینی دەربکەویت، دەبێت چی بکەیت، تا خۆت لە کەسێکی بە کەم سەیرکراو، ڕزگار بکەیت؟

کاتێك کە دەڵێین: دەمانەوێت لە یەکەم چاوپێکەوتندا سەنگین بین، چۆن دەکرێت؟ پێویستە لەسەرمان چی بیکەین؟

ئەوەشمان بیرنەچێت، ڕاستە یەکەم چاوپێکەوتن گرنگە، بەڵام بۆئەوەی بە سەنگینی بمێنینەوە، پێویستە هەمیشە هەوڵ بدەینو بڕیار بدەین، واز لە کۆمەڵێك شتی لاوەکی بهێنین.

لە یەکەم چاوپێکەوتندا سەنگین بە، بکە بەخاڵی دەستپێك، کەواتە ئەم خاڵە، بۆ هەرکەسێك، کە ئارەزووی ئەوە دەکات ببێتە کەسێکی سەنگین، لەناو کۆمەڵگەدا.

وشەی (سەنگین) ئەگەر واتاکەی شی بکەینەوە، واتە بوونی سەنگێك لەناو کۆمەڵگەدا، خاوەنی کێشو قورساییەك لەناو کۆمەڵگەدا، واتە تۆ هەیت، ڕێزو کێشت هەیە، هێندەی مامەڵەی خۆت قورساییت هەیە، دەوروبەر ڕێزت لێدەگرن، ئاڵوگۆڕی زانیاریت لەگەڵدا دەکەن، بیروبۆچوونت وەردەگرن.

کاتێك تۆ کەسێك دەبینیت، یان چاوت بە کەسێك دەکەوێت، یەکەم گفتوگۆت، لەگەڵ ئەو کەسەدا، سەنگی تۆ بۆ ئەو کەسە دیاری دەکات، بۆیە پێویستە گفتوگۆکەت بەشێوەیەك بێت، لەگەڵ سەنگی تۆدا بگونجێت، بەشێوەیەکی زۆر لەسەرخۆ قسە بکە، هەرگیز بەدەنگی بەرز قاقا مەکە، با لە کاتی قسەکردندا، زەردخەنەیەك لەسەر لێوت بێت، ڕووت گرژ مەکە، ڕێز لە بەرامبەرت بگرە، بە (کاك، یان خاتوون، یان بەڕێز) بانگی بکە، لەبیرت نەچێت، هێندە بە باڵایدا هەڵمەدە، کە بەرامبەرەکەت خۆی بەسەرتدا بسەپێنێتو تۆ بە چاوی کەم سەیر بکات، با هەڵسوکەوتت بە شێوەیەکی مامناوەندی بێت، ڕێزی بگرە، زیاتر لەوەی ئەو ڕێزی تۆ دەگرێت، ڕێز لە بیروبۆچوونەکانی بگرە، هەرگیز قسەی پێ مەبڕە.

ئەگەر چاوپێکەوتنی یەکەم کۆتایی هاتو تۆ زۆر بە وریاییەوە مامەڵەت کرد، کەواتە تۆ سەرکەوتوو بوویت، لە یەکەم چاو پێکەوتندا، ئێستا کاتی چاوپێکەوتنی دووەمو سێیەمو... هتد، بەڵام ئێستا ئەوەی لەسەر تۆ بووەتە ئەرك، ئەوەیە کە کارێکی وا نەکەیت، کە چاوپێکەوتنی یەکەم، بێ ئەنجام بکەیت، پێویستە لە چاوپێکەوتنەکانیی دیکەدا، خاوەن ئاکارو ڕەوشتی بەرز بیت، ئەگەر سوعبەتو گاڵتەکانت، لەگەڵ بەرامبەردا، بەپێی پێویست بێتو گاڵتەشی لێ قبوڵ بکە. پێویستە تۆ بەردەوام، ئاگات لە ڕەوشتت بێت، چونکە ڕەوشت، کرۆکی سەنگینبوونی مرۆڤەکانە، ئاینی پیرۆزی ئیسلامیش، گرنگیی زۆری بە ڕەوشت داوە، ئەگەر دەتەوێت کەسێکی سەنگین بیت، پێویستە هەتا کۆتایی ژیانت، خاوەن ڕەوشتێکی بەرزبیت.

* من نەمتوانی لە چاوپێکەوتنی یەکەمدا، سەنگینی خۆم ڕابگرم، بەڵام دەمەوێت لەمەودوا ببمە کەسێکی سەنگین، ئەمە کارێکی زۆر زەحمەت نییە، بەڵام زۆریش ئاسان نییە، بۆ ئەم کارەش، یەکەم شت پێویستە، تۆ بڕیار بدەیت، باوەڕت بە خۆت هەبێت، لەوانەیە توشی دابڕان ببیت، بەڵام پێویستە، بەرگە بگریت، هەربۆیە کە تۆ بڕیارت دا، کەسێکی سەنگین بیت، دەبێت یەکسەر بێدواکەوتن، دەست پێبکەیت، لە کاتی گفتوگۆکانتدا پێویستە بە تەواوی ئاکارو ڕەوشتی خۆت بگۆڕیت، بە سیفەتێکی جیاواز، بە شێوازێکی جیاواز، بە ڕەوشتێکی جیاواز، تەنانەت بە پەیامێکی جیاواز، مامەڵە بکە، پێویستە بگەڕێیت بەدوای ئەو هۆکارانەی، بۆتە هۆی ئەوەی کە تۆ وەکو کەسێتییەکی لاواز دەربکەویت، هەوڵبدە، ماندووببە، زۆرجاریش توشی دابڕان دەبیت، توشی خەمو پەژارەش دەبیت، بەڵام لەسەر تۆ پێویستە، کە متمانە بەخۆبوونت، هێندەی کێوێکی بەرزبێت، بۆ ساتێکیش سارد نەبیتەوە، ڕەوشتێکی جوانی مرۆڤایەتی، پێشکەش بکەیت.



ئا: خەندە عوسمان

# دیدارێك لەگەڵ بەڕێز ئەندازیار ((محمد شیراز صفاء))

## سەبارەت بە: سیستمی GIS و ڕۆڵی لە پلاندانانی شارو هەرێمەکاندا!

سەرەتا بە ناساندنی بەڕێزیان دەست پێدەکەین، ئەندازیار ((محمد شیراز صفاء)) (دەرچووی کۆلێژی ئەندازیاری ڕووپێویو GIS)یە، لە ساڵی (٢٠٠٢)وە لە بواری GIS کاردەکات، لە ساڵی ٢٠٠٤-٢٠٠٦ مامۆستا بووە، لە بەشی ئەندازیاریی پلانسازی شار، لە کۆلێژی تەکنیکی سلێمانی.. لە ساڵی ((٢٠١٠)) بەڕێوەبەری سەنتەری GIS بووە لە پارێزگای سلێمانی، لە ساڵی (٢٠١١)وە بەڕێوەبەری بەڕێوبەرایەتییەکانی نەخشەی بنەڕەتیو ڕووپێوییە، لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی شارەوانییەکانی سلێمانی..

-سیستمی GISو ڕۆڵی لە پلاندانانی شارو هەرێمەکان، جیهانی ئەمڕۆ لە پێشکەوتنێکی زۆر خێرای زانیارییەکاندایە، ئاسان نییە، مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت بەبێ بەکارهێنانی GIS، کە ئێستا لە زۆربەی بوارەکاندا بەکاردێتو ئاسانکارییەکی تەواوی بۆ بەکارهێنەرانی کردووە.

**• مەبەست لە سیستمی GIS چییەو مێژووی سەرهەڵدانی بۆ کەی دەگەڕێتەوە؟**

* GIS کورتکراوەی (Geographic information system) واتە سیستمی زانیاری جوگرافی، سەرەتا لە ساڵانی پەنجاکاندا دەستکرا بە دروستکردنی ئەم سیستمە، ئەمریکاو وڵاتانی پێشکەوتوو، توانیان لە ڕێگەی ئەم سیستمەوە، شارەکان ڕێکبخەنو ئەو کێشانەی کە لەناو شارەکانو پلاندانانندا هەیە، چارەسەری بکەنو لە هەموو بوارەکانی دیکە سوودی لێوەربگرن، نەك تەنها لەبواری مەدەنیدا، بەڵکو لە بواری سەربازیشدا، سوودێکی زۆریان لێوەرگرتو پەرەیان پێدا، هەروەها لەگەڵ پێشکەوتنو بەرەوپێشچوونی کۆمپیوتەرو بواری پرۆگرامیندا، کۆمپانیای ESRE، کە کۆمپانیایەکی ئەمریکییە، بەرنامەی (ARC - GIS)ی دروست کرد، کە سەرەتا ڤێرژنی ٣ بوو، ئێستا ڤێرژنی (١٠,١)ی هەیە، کە ئەویش زۆر بەکار نایەت، ئێستا لە ئینتەرنێتدا، خزمەتگوزارییەك هەیە، پێی دەوترێت GIS cloud، واتە هەوری GIS، کە دەتوانیت بە credit cardی خۆت، بەرنامەکە بەکاربهێنیت، بۆ ئەو ماوەیەی کە پێویستەو لە پاش تەواوکردنی نەخشەو کارەکانت بە GIS، دەربچیت لە بەرنامەکە، کە ئەمەش کارئاسانییەکی ترە، لەبری ئەوەی بەرنامە بکڕیت کە بە ١٠٠٠٠$، چونکە بەرنامەکە، داتاو نەخشەی هەموو جیهانی لەسەرەو بە هەموو کەس نادرێت، بۆئەوەی بۆ مەبەستی خراپ بەکارنەهێنرێت، بەڵام لە کوردستاندا بەرنامەکە کراك کراوەو ئەو بەرنامەیەی کە بەکاری دەهێنیت، پەیوەندی نییە لەگەڵ کۆمپانیای ESREو ناتوانیت زانیارییە جیهانییەکان، بەکاربهێنیت، تەنها دەتوانیت، لە سنوری کارەکەی خۆتدا، کاری پێبکەیت.

**• سیستمی GIS لە چی پێکدێت؟**

* ئەم سیستمە لە شەش تەوەرەی سەرەکی پێکدێت:-

**یەکەم: hardware:-** کە هەموو ئەو ئامێرانە دەگرێتەوە، لە کاتی کارکردنی سیستمەکەدا وەکو (سکانەر- پرینتەر- کۆمپیوتەر- ئامێری Total station - GPS - ... هتد)، بەکار دەهێنرێت.

**دووەم: software:-** بریتییە لە بەرنامەی ARC GISو هەموو ئەو بەرنامانەش، کە بەکاری دەهێنیت لە serverی GIS.

**سێیەم: Project:-** ئەو پرۆژەیەیە، کە تۆ کاری لەسەر دەکەیت، بۆ نموونە GIS بەکار دەهێنیت لە پلاندانانی شاردا.

**چوارەم: هێزی کار، یاخود ئەو کارمەندانەی کار لەسەر GIS دەکەن:-** مەبەست لەو کەسانەیە، کە لەناو سیستمەکەدا کاردەکەن، بۆ نموونە: سیستمەکە لە کۆمەڵێك بەش پێکهاتووە؛ وەکو (کۆکردنەوەی داتا- شیکردنەوەی داتاکان- پلاندانان- دیزاین-... هتد)، ئەمانە هەریەکەو پسپۆڕییەکی هەیە، هەر ئەندازیارێك، یان هەر کارمەندێك، بەپێی پسپۆڕییەکەی خۆی، لە سیستمەکەدا کار دەکاتو بە کۆی هەموویان سیستمەکە پێکدەهێنن.

**پێنجەم: Network GIS server:-** بریتییە لەو (server)ی کە لە GISدا بەکاری دەهێنیت، لە ڕێگەی بەرنامەیەکی کۆمپیوتەرییەوە، ئەم serve، دروست دەکرێتو کارەکانت بۆ ئاسان دەکات، بۆ نموونە: ئەگەر بە ڕێوەبەرە گشتییەکەی من، بیەوێت ئەو نەخشانەی کە من بە GIS دروستمکردون ببینێت، دەتوانێت لە ڕێگەی ئینتەرنێتەوە server بەکار بهێنێت، هەروەها لەناو serverدا ئاستمان هەیە، بۆ نموونە: بەڕێوەبەری گشتی، بۆی هەیە هەموو نەخشەکان ببینێت، بەڕێوەبەری بەشەکان بۆیان هەیە، تەنها ئەو نەخشانە ببینن، کە پەیوەندی بە خۆیانەوە هەیە، کارمەندەکان بۆیان هەیە، ئەو نەخشانە ببینن کە پەیوەندی بە

کارەکەیانەوە هەیە، ئەم (permission) ڕێگەپێدانە سوودی زۆری هەیەو نابێتە هۆی درووستکردنی کێشە، ئەمە لە بوارە مەدەنییدا زۆر کێشە درووست ناکات، بەڵام لە بواری سەربازییدا؛ بۆ نموونە: هەندێك نەخشە هەیە، نابێت سەربازەکان بیبینن‌و پەیوەندی بە وڵاتو شەڕکردنەوە هەیەو نابێت بکەوێتە دەست هەموو کەس، لەبەرئەوە ئەم ئاستانەی کە لە serverدا هەیە، زۆر گرنگەو دەبێت هەبێت.

شەشەم:- داتا Data:- سیستمەکە بە تەواوی پشت بە داتاو زانیارییەکان دەبەستێتو داتاکان، بەشێکی گرنگی سیستمەکە، پێکدەهێنن.

**• ئەو بوارانە کامانەن، کە سیستمی GISی تێدا بەکاردەهێنرێت؟**

* لە ئێستادا سادەترین بەکارهێنانی GIS، ئەوەیە کاتێك دایکێك کە فەرمانبەرەو منداڵەکەی لەماڵەوە بەجێ دەهێڵێت، چاکەتێك دەکەنە بەری منداڵەکە، کە ئامێرێکی GPS بچووکی تێدایە، دەبەسترێت لەگەڵ کۆمپیوتەرەکەی دایکی‌و ماڵەکەی خۆی بۆ دەکرێت بە سنوورێك، کە هەرکات لێی تێپەڕبوو، دایکەکە لە ڕێگەی کۆمپیوتەرەکەیەوە ئاگاداردەکرێتەوە.. بەڵام گەورەترین‌و پێشکەوتووترین بەکارهێنانی GIS لە بواری سەربازیدایە، بۆ پلانی شەڕو ئاراستەکردنی موشەکو بۆمببارانکردن، هەروەها لە بوارە جۆربەجۆرەکانی دیکەدا وەکو (چاودێریکردنی ژینگەو ئاژەڵان- درووستکردنی نەخشە- ڕووپێویی- ئامار- پلانی شارو هەرێمەکان- ماستەرپلان ...هتد)، لە ئێستادا GIS چۆتە هەموو بڕگەکانی ژیان‌و لە هەموو بوارێکدا بەکار دێت، تەنانەت لە کاتی بڵاوبوونەوەی نەخۆشییەکدا، ئەم سیستمە بەکار دەهێنرێت؛ بۆ زانینی ئەوەی لە چ شارێکدا، بڵاوبۆتەوەو هۆکارەکەی چییەو شیکردنەوەی بۆ دەکەن‌و دەزانن لە کوێوە هاتووەو چۆن کۆنترۆڵی بکەن.

**• لە بواری پلاندانانی شارو هەرێمەکان سیستمی GIS ڕۆڵو کاریگەری چییە؟**

* ئاسانکارییەکی زۆری کردووەو لە ماوەی سێ ساڵی ڕابردوودا، هەرچی ماستەرپلانی شارەکان هەیە، بە GIS کراوەو کاریگەرییەکی زۆری هەبووە، لە چارەسەرکردنی ئەو کێشانەی کە لە شارەکاندا هەیەو دیاریکردنی شوێنی چالاکی‌و خزمەتگوزاری‌و چۆنییەتی بەکارهێنانی زەوی لە شارەکان‌و بەکارهێنانی بۆ خزمەتگوزارییەکانی ئاوو ئاوەڕۆو ڕێگاوبان‌و دیاریکردنی ئاراستەو شێوەی گەشەکردنی شارەکان لە داهاتوودا، بۆ زۆر بواری دیکەش.

**• سیستمی GIS لە کەیەوە لە هەرێمی کوردستاندا کاری پێدەکرێتو لە بواری پلاندانانی شارو هەرێمەکان سوودی هەبووە؟**

* لە کوردستاندا لە ساڵی ٢٠٠٠وە لە ڕێگەی ڕێکخراوەکانەوە، سیستمەکە بەکارهێنراوە، بەڵام لە بەڕێوبەرایەتییەکان لە ساڵی ٢٠٠٤و ٢٠٠٥وە بەکارهێنراوەو تائێستاش وەکو پێویست بەکار نایەتو حکومەتیش بە تەواوەتی سیستمەکەی نەخستۆتە کار لەناو بەڕێوبەرایەتیەکانداو پشگیری تەواوی نەکردووە، بەڵام ئەگەر GIS، لە تەواوی وەزارەتو بەڕێوبەرایەتییەکان بە شێوەیەکی زانستی‌و ڕێکوپێك، بەکاربهێنرێت، ئاسانکارییەکی تەواو بۆ کارەکان دەکات، بۆ نموونە: وڵاتێکی وەکو ئەمریکا، لە بەڕێوەبردنی فوتابخانەیەکەوە، هەتا وەزارەتی بەرگریی ئەمریکا، GIS بەکار دەهێنێت، هەرچەندە ئێستا لە هەرێمی کوردستانیشدا، ماستەرپلانەکان بەم سیستەمە دەکرێت، بەڵام بەداخەوە ئەو کۆمپانیایانەی کە شارەوانی گرێبەستی لەگەڵدا کردوون، زۆربەی ئەو کۆمپانیایانە، لە وڵاتی خۆیان بوونی نییە، یاخود کۆمپانیای وەهمین‌و لە وڵاتی خۆیاندا، هیچ پڕۆژەیەکیان ئەنجام نەداوەو سانتیمەترێکیشیان دیزاین نەکردووە، یان پسپۆڕ نین لەو بوارەداو زۆربەی شارەکانیان تێکداوە.

**• ئەو کێشەو گیروگرفتانە چین، کە لە کاتی بەکارهێنانی سیستمی GISدا، ڕووبەڕووتان دەبێتەوە؟**

* ئێمە لە کوردستاندا، کێشەیەکی زۆر گەورەمان هەیە، ئەویش کێشەی هاوتانەبوونە، یان نەگونجانی دووری ئەو (satellite image وێنەیەی لە مانگی دەستکردەوە وەردەگیرێت بۆ ڕووبەرێکی زۆر گەورە، بەڵام وردییەکەی، تا ٥٠ سم)، یاخود erial photographer بۆ ڕووبەرێکی کەم بەکاردەهێنرێتو بەکاری دەهێنین، بەڵام وردییەکەی زیاترەو دەگاتە چەند سانتیمەترێك، لەگەڵ شوێن‌و زەوییەکان، ئەویش لە ڕێگەی control point (کۆمەڵێك خاڵە، کە دورییەکەی زانراوەو پشتی پێدەبەسترێت بۆ دابەزاندن‌و بەرزکردنەوەی ئەو زەوییەی، کە تۆ ماستەر پلانەکەت، یان لە نەخشەکەی خۆتدا، درووستی دەکەیت) دەکرێت، بەڵام لە کوردستاندا control point و GPS station (هەموو دوورییەکان لە مانگی دەستکردەوە وەردەگیرێت، کە لە کاتی ڕاستو داتای ڕاستدا نییە، هەوڵدراوە درووست بکرێت، خاڵێکمان هەیە لە هەولێر GPS station هی وەزارەتی سەرچاوەکانی ئاوی عێراقە، تا ئێستا سوودی لێوەرنەگیراوە وەکو پێویست، هەروەها ئەو کەسانەی کە سەرپەرشتی کۆمپانیاکان دەکەن، کەسانی پسپۆڕ نین، ئەمەش وایکردووە لە ٨٠٪ ئەو ماستەرپلانانەی کۆمپانیاکان دەیکەن، شکستی هێناوەو سیمای شارەکانیان تێکداوە، بۆ نموونە: ئەو ماستەرپلانانەی کە بۆ قەڵادزێو چەمچەماڵ کراون، ناتوانین خاڵەکانی داببەزێنین بۆ سەر زەوییەکە، نەك تەنها لە بەکارهێنانی سیستمەکە، بەڵکو ماستەرپلانەکان، لە دانانی پلانەکەش کێشەیان هەیە.

**• بۆ باشترکردنی سیستمەکەو ئەو کێشەو گیروگرفتانەی، لە کوردستاندا هەن، پێشنیاری بەڕێزتان چییە؟**

* لە کۆتاییدا پێشنیار دەکەم، دامەزراوەیەك درووست بکرێت، لە هەموو کوردستاندا، کە ئەم دامەزراوەیە تایبەت بێت بە ماستەرپلان‌و نەخشەدانانی شارو گوندەکان، کە سیستمی GISی تێدا بەکاربێت، ئەندازیاری پسپۆڕو کەسانی پسپۆڕ، لەو بوارەدا کۆبکرێنەوەو پشتگیری لێبکرێت لەلایەن حکومەتەوە، ئەو کارانەی پێبسپێردرێتو لە ڕێگەی خولەوە، زیاتر پەرە بە توناکانیان بدرێت، بۆئەوەی بتوانین خۆمان بە توانای خۆمان، ماستەرپلانەکان درووست بکەین، نەك تەنها بۆ شارێك، بەڵکو بۆ سەرجەم شارەکان، لەجیاتی ئەوەی ئەو پارە زۆرە بەهەدەر بدرێتو هیچیشمان بۆ نەکەن.




# زاراوەی کارگێڕی..

وەهاب حەسیب

*** کاتی هاوینە (التوقیت الصیفی):-** واتە پێشخستنی کات بە (٦٠) خولەك، بەشێوەیەك دەستپێکی دەوامی کارمەندان لە دەزگاحکومییەکان، دامەزراوەکان، کاژێرێك پێشبخرێت بە بەراورد بەکاتی زستانە.

بەکارهێنانی کاتی هاوینە، لە ئەنجامی بڵاوکردنەوەی راپۆرتێك بوو لەلایەن (بنیامین فرانکلین)ەوە، لەبارەی کردنەوەو داخستنی فرۆشگاکان لە کاتێکی زوودا، بۆ ئەوەی سود لە رۆشنایی وەربگرن، کاتێك (بنیامین فرانکلین) ئەم بیرۆکەی نووسی، خۆی کارمەندی حکوومەت بوو لە فەرەنسادا.

ئەم بیرۆکەیە، لە کاتی جەنگی جیهانی یەکەمداو لە ساڵی (١٩١٨) لە ئەمریکا جێبەجێ کرا، پاشان وڵاتانی تر، دەستیان کرد بە جێبەجێکردنی، بۆ یەکەمجار لە عێراق لە ١٩٨٢/٤/١ جێبەجێکرا، دواتر پاش رووخانی حزبی بەعس پەرلەمانی عێراق، ئەو بریارەی هەڵوەشاندەوە.

**پۆلێنکردنی کار(تصنیف الوظائف):-** پۆلێنکردن بەگشتی، واتە کۆکردنەوەو رێکخستنی کەسەکانو شتەکان "ئامێرو ئامرازەکانی کارکردن، زانیارییەکان ... هتد" لە چەند دەستەو کۆمەڵێکدا، بەگوێرەی چەند پێوانەیەکی دیاریکراو، لەوانە: هاوشێوەیی لە خەسڵەتو تایبەتمەندیدا، تەواوکاری لە چالاکیو ئامانجدا. بنەماکانی رێکخستنیش، بە گوێرەی کرداری پۆلێنکردنو بە پێی ئامانجەکان دەگۆڕێن، ئامانجی کۆکردنەوە، جیاکاریو جیاکردنەوەی ئەو شتانەیە کە بنەماو خەسڵەتیان، لەم بوارەدا لەیەکتر جیایە.

بە دیاریکراوی، کرداری پۆلێنکردنی کار واتە: کۆکردنەوەی کارەکان بەشێوەیەکی رێکخراو، لە چەند دەستەو تیپێکدا؛ لەسەر بنەمای مافو بەرپرسیارێتیو ئەو پێداویستیانەی پێویستن بۆ بەگەڕخستنیان، ئەم رێکخستنە هەموو ئەو کارانە دەگرێتەخۆ، کە لە جۆری ئیشو کارگرانیو بەرپرسیارێتیدا هاوشێوەن، کارو کارگرانیو بەرپرسیارێتی بە پلەی یەکەم، هۆکارن بۆ پۆلێنکردنی کارەکان، چونکە یارمەتیدەرە لە ئاشکراکردنی لێهاتوویو شارەزاییدا، بۆ بەگەڕخستنی ئەو کارانە، پاشان رێکخستنی کارەکان لە بواری داراییدا.

*** سەرژمێریی دانیشتوان (تعداد السکان):-** دەوڵەت ماوەی (٥ - ١٠) ساڵ جارێك، یان زیاتر هەڵدەستێت بەسەرژمێریکردنی دانیشتوان، لە کاتی سەرژمێریکردنەکەدا، رەچاوی شوێنی نیشتەجێبوون دەکرێت، بەدەر لەوەی هاوڵاتیان، دانیشتووی ئەو جێگایەن، یان نا، ئەم شێوازەی سەرژمێریکردن، رێگایەکی ئاسانە، پێویستە لە کاتێکدا جێبەجێبکرێت، بارودۆخی وڵات ئارام بێت. هەروەها لە هەندێ کاتدا، پێویستە سەرژمێریکردن، ئەنجام نەدرێت، وەك: لە کاتی بۆنە نەتەوایەتیو ئاینییەکاندا، وەرزەکانی گەشتیاریی، جەنگو ئەو کاتانەی خەڵك لە گەشتو سەیراندان، خەوشی بنەرەتی ئەم شێوازە ئەوەیە: دابەشبوونێکی راستەقینەی جوگرافیای دانیشتوان نادات بەدەستەوە. بەڵام لە کاتی سەرژمێریکردنەکەدا، دەتوانرێت خەوشەکانی ئەم شێوازە، بە پرسیارکردن لە شوێنی نیشتەجێبوونی هەمیشەیی دانیشتوان، تێبپەڕێنرێت. بەوەی لە کاتی درووستکردنی خشتەو ریزبەندکردنی پرسیارەکاندا، یەکێك لە پرسیارەکان بۆ شوێنی نیشتەجێبوونو پرسیارێکی دیکە، بۆ شوێنی نیشتەجێبوونی هەمیشەیی تەرخان بکرێت.

لە هەندێ وڵاتدا سەرژمێریکردن، لەسەر بنەمای شوێنی نیشتەجێبوونی هەمیشەیی ئەنجام دەدرێت، بەدەر لەوەی هاوڵاتی دانیشتووی چ ناوچەو هەرێمێکە. بەم شێوازە دەوترێت سەرژمێریی تیۆریی، تایبەتمەندیی ئەم شێوازە، ئەوەیە کە وێنەیەکی راستەقینەی دابەشبوونی دانیشتوان لە رووی جوگرافییەوە دەخاتە بەردەست، کێشەی ئەم شێوازە ئەوەیە، کە تێچوونی زۆرە، بەتایبەت لە رووی ئەو پرسیارانەی لەبارەی شوێنی نیشتەجێبوونی هەمیشەیی، لە دانیشتووان دەکرێت. لە هەمان خشتەدا.

رێنمایی نووسینگەی نەتەوە یەکگرتووەکان، لەبواری ئامارداا ئەوەیە، کە بۆ سەرژمێریکردن، هەردوو شێواز بەکاربهێنرێت، چونکە هەر شێوازێك سوودی کرداریی خۆی هەیە.

شێوازی یەکەم، سوودی لە زانینی گردبوونەوەی دانیشتوان لە پایتەختو شارەگەورەکانو رێژەی قەرەباڵغی ئەو جێگایانەدا دەردەکەوێت، دەتوانرێت لە پلاندانانو دابینکردنی خزمەتگوزارییە گشتییەکاندا، سوود لە شێوازی یەکەم وەربگیرێت، بەڵام شێوازی دووەم، دابەشبوونی جوگرافیای دانیشتوان، بەشێوەیەکی راستەقینە پیشان دەدات، لەم شێوازەداو لە کاتی هەڵبژاردنە جیاوازەکاندا، دابەشبوونی قوتابخانەو خوێندنگەو نەخۆشخانەکان دەردەکەوێت.



# وەرزی مەرگی ڕێویان!

ئا: محەممەد مێرگەیی

ڕۆژێکیان، ڕێوی فێڵباز زۆر برسی بوو، لەبەرئەوەی چەند شەوو ڕۆژی لەسەر یەکدی بەسەربردبوو، بێئەوەی بە تەواوی سکی تێر بکات، بۆیە ڕووی کردە لای کێڵگەکان، بەڵکو لەوێ نێچیرێکی تازەی دەست بکەوێت. ڕێوی خۆی لە نێوانی درەختەکاندا حەشاردا، نەوەك وەرزێرەکان ببیبنن‌و بە چەك‌و سەگەکانیان هەڵکوتنە سەری. دوای ئەوەی کات تێپەڕی، بێئەوەی هیچ شتێك بەدەست بهێنێت، سەرنجی دایە وەرزێرێك، کە قەفەزێکی مریشکانی بەدەستەوەبوو، ڕێوی بەپەلە بیری لە تەڵەکەیەك کردەوە، کە بە هۆیەوە هەموو مریشکەکانی ناو قەفەزەکە بخوات. بیرۆکەیەکی فێڵبازانەی بۆ هات. ڕێوی بەخێرایی لەناو دارو درەختەکانەوە، کەوتەوە پێش وەرزێرەکە، بێئەوەی ئەو هەستی پێبکات. کاتێکیش گەیشتە پێشەوەی هەمان ئەو ڕێگەیەی وەرزێرەکە گرتبوویە بەر، ڕێوی خۆی خستە سەر زەوی‌و سکی خۆی پڕهەوا کرد، ئینجا هەناسەی لە خۆی بڕی؛ بەشێوەیەك وەك ئەوەی مردبێت.

کاتێك وەرزێرەکە لێی نزیکبووەوە، تەماشایەکی ڕێوییەکەی کرد، لە دڵی خۆیدا گوتی: لەوەدەچێت ئەم ڕێوییە لە برسان مردبێت، چ برینێك بەسەر لاشەیەوە نییە. وەرزێرەکە ڕێگەی خۆی گرتەوەبەرو ڕێویش بە نەرمی هەستایەوەو سەرلەنوێ بەناو دارو درەختەکانەوە ڕێگەی گرتەبەر، هەمدیسان بەپێش وەرزێرەکە کەوتەوەو دووبارە خۆی خستەوە سەرزەوی‌و وەك جاری یەکەم، سکی خۆی پڕهەوا کردو هەناسەی لە خۆی بڕی. وەرزێرەکە تەماشای ڕێوییەکەی کردو گوتی: ئەمەش ڕێوییەکی دیکەیە، لە برسا مردووە، ئینجا بەردەوام بوو لە ڕۆیشتن.

ڕێوی بەمە خۆشحاڵبوو، کاتێك دڵنیابوو لە دوورکەوتنەوەی وەرزێرەکە، دیسان وەك جاری یەکەم‌و دووەم، لەناو درەختەکانەوە بەپێش وەرزێرەکە کەوتەوە، دیسان خۆی خستەوە سەر زەوی‌و سکی خۆی پڕهەوا کردو وەك ئەوەی مردبێت، هەناسەی لەخۆی بڕی. وەرزێرەکە کە ئەمەی بینی بە سەرسوڕمانەوە ڕاوەستاو تەماشایەکی دەوروبەری کرد، بزانێت هۆی مردنی ڕێوییەکان چییە، ئینجا بە سەرسامییەوە لەبەرخۆیەوە گوتی: ئایە ئەمە وەرزی مەرگی ڕێویانە؟ بەڵام لەم بیرکردنەوەی نەگەیشتە هیچ ئەنجامێك‌و ملی ڕێی گرتەوەبەر.

کاتێك ڕێوی ئەمەی بۆ چەند جارێکی دیکە دووبارە کردەوە، کابرای وەرزێریش زیاتر سەری لەمە سوڕما، بۆیە بڕیاریدا بە ڕێگەی خۆیدا بگەڕێتەوەو بچێت ڕێوییە مردووەکان بژمێرێت‌و بزانێت هۆی مردنی ڕێیوییەکان چییە؟ ئەوەبوو قەفەزی مریشکەکانی بەسەر دارێکەوە هەڵواسی‌و ڕۆیشت ڕێوییە مردووەکان بژمێرێت، کاتێك وەرزێرەکە، لە بەرچاوی ڕێوی دیارنەما. ڕێوی فێڵباز، بە دەرفەتی زانی‌و بەخێرایی قەفەزەکەی ڕفاندو بردی. پاش کەمێك وەرزێرەکە گەڕایەوە، بەڵام زۆر سەری سوڕما لە بزربوونی لە ناکاوی ڕێوییە مردووەکان، کە لە دارەکە نزیکبووەوە شوێنپێی ڕێوی بینی لەسەر زەوییەکەو قەفەزی مریشکەکانیش نەمابوو، ئینجا وەرزێرەکە لە فێڵ‌و تەڵەکەی ڕێوی تێگەیشت‌و پەشیمانبووەوە لەوەی بە ئاسانی فریوی خوارد، بەڵام دوای چی؟!

کەواتە با ئێمە هەر لە سەرەتاوە بڕوا بە فێڵ‌و تەڵەکەی ڕێوییەکان نەکەین، ئەگەرنا دوچاری هەمان چارەنووسی وەرزێرەکە دەبین، کاتێك دەزانین کارلەکار دەترازێت‌و چارەسەر ئەستەم دەبێت.. خۆشەویستان.. ڕێوییەکان یەك جۆر فێڵ نازانن، بەڵکو سەدان فێڵ‌و تەڵەکە دەزانن، بۆ بەدیهێنانی مەرامەکانیان.

سەرچاوە: گۆڤاری (العربی الصغیر) ژمارە ١٤٤ — ساڵی ٢٠٠٤.



# درووست کارکردن = بە ئازادی کارکردن

ئا: درەخشان بەهادین

درووست کارکردن واتە ئەنجامدانی کارێکی درووست، کاری درووست چییە؟ ئەو کارەیە کە بۆ خزمەتی خۆمانو خەڵکی دیکەیە، یان کارێکە کە زیانی بۆ خۆمانو کەسی دیکە نییە.

درووستکاری بە تەواوی وەك پایەو بنچینەی بینایە، ئێمە ئەگەر بمانەوێت، بینای کەسێتیمان بونیادێکی پتەوو دڵنیایی هەبێت، ئەوا درووستکاری بۆمان دەبێت بە بنەماو بنەڕەتی کارکردنمان. بەڵام درووست کارکردن، لە کارە بچووکەکانەوە دەست پێدەکات، ئێمە هەندێجار لە کاروباری ڕۆژانەماندا، هەندێ کاری نادرووست دەکەین، وا بیر دەکەینەوە، کە بێ کێشەیە. بەڵام پابەندبوون بە بەها ڕەوشتییەکانەوە، پەیوەندی بە گەورەو بچووکی کارەکانەوە نییە. درۆ، درۆیە؛ چ درۆی بچووكو بەرژەوەندیی بێت، یا درۆیەکی گەورە. دزی، دزییە؛ چ دینارێك بێت، چ ملیۆنێك دینار. کاتێك کە دەڵێن: «هێلکەدز، دەبێتە وشتردز»، ئاماژەیە بۆ ئەو ڕاستییە. هەمیشەش بە لاڕێداچوونیش لە شتە بچووکەکانەوە دەست پێدەکات، تاوەکو گەورەو گەورەتر دەبێت، لە کۆتایشدا لە شوێنێکی وەها نامۆدا، خۆمان دەبینینەوە، کە تێیدا وێڵو حەیرانین، کە چۆنو بۆچی ڕێمان بەوێدا گەیشتووە.

زۆربەمان، کاتێك کە کارێکی نادرووست ئەنجام دەدەین، لە دڵماندا هەست بە ئازارو ناڕەحەتییەك دەکەین، بەڵام بە هۆی مێشکمانەوە، دەیان بەڵگە دەهێنینەوە، تا کارەکەمان بە ڕەوا لە قەڵەم بدەینو بە خۆمانی بسەلمێنین، کە ئەنجامدانی «گرفت»ی نابێت، بەم شێوەیەش گرفتەکەمان خێرا «چارە» دەکەینو «پێش» دەکەوین. بەڵام بە دەستبەرداربوونو چاو پۆشیکردن لە درووستکاری، هیچ شتێك چارەسەر نابێتو سەرەنجامیش هیچ بەرەو پێشچوونێك نایەتە ئاراوە. بە پێچەوانەوە، لەبەرئەوەی بینای کەسێتیی تەندرووست، لە سەر درووست کارکردن بنیاتنراوە، بۆیە بە ئەنجامدانی هەر کارێکی نادرووستی بچووکیش، درزێك دەکەوێتە بینای کەسێتیمان. بە تێپەڕبوونی کات، ئەو درزە بچووکانە، بە یەك دەگەنو درزو کەلێنی گەورە درووست دەکەن، کە لە بەردەم بەرەو پێش چوونماندا، دەبنە بەربەستو دواتریش هۆی کەوتنمان. لەبەرئەوە بێ بوونی درووستکاری، هیچ سەرکەوتنێکی ڕاستەقینە لە ئارادا نییە. لەوانەیە چەند ڕۆژێك، بتوانین بە لەبەرچاو نەگرتنی ئەو یاسا ئاڵتونییە، کارەکانمان بەرەو پێش بەرین، بەڵام لە کۆتاییدا دەگەینە

بنبەستو بۆ هەزارەمین جار بۆمان دەسەلمێت، کە «باری لار، بە هەوار ناگات».

پاراستنی دورووستکاری، پەیوەستە بە سەرنجی بەردەوامو ئاگاداریو هۆشیاری هەمیشەیی. بەڕێوەبەری کۆمپانیایەکی سەرکەوتوو دەڵێت: «من هەمیشە هەوڵم داوە، کە بەم یاسا سادەوە بژیم، ئەویش ئەوەیە: کارێك مەکە، ئەگەر سبەی لە ڕۆژنامەدا خوێندتەوە، نارەحەت بیت». ئەمە یاساو هەڵسەنگاندنێکی باشە، تا پێوەی پابەند بین. بەڵام دورووستکاری ڕاستەقینە، لەمە سەروترە، دورووستکاری ڕاستەقینە، بابەتێکە پەیوەندی بە دەروونەوە هەیە، واتە ئەگەر ڕۆژنامەیەکیش نەبێت، هەواڵی کارەکەمان بڵاو بکاتەوە، یان پۆلیسێك نەبێت، یاسا جێبەجێ بکات، یان کەسێك نەبێت، لە کاتی ئەنجامدانی کارەکەدا، بمانبینێت، دیسان بە دورووستکاری دەمێنینەوە.

زۆرێك لە مرۆڤەکان، کاتێك کە کارێکی نادرووست ئەنجام دەدەن، لەبەرئەوە نییە، کە مرۆڤێکی خراپن، بەڵکو لەبەر بوونی تێڕوانینی هەڵەو دیدی کورتبینانە بۆ کارەکانیان. وەك ئەوەی:-

١- ئێمە وا وێنای بابەتەکە دەکەین، کە بەو کارەمان زیان بە کەس ناگەیەنین، لە کاتێکدا کە زیانی هەیە، یەکەمجار بۆ خۆمان، پاشان بۆ کەسانی دیکە.

٢- وای بۆ دەچین، کەس ئاگادار نییەو نامانبینێت، لە کاتێکدا دەبینرێن؛ سەرەتا خوداو پاشانیش خەڵك.

٣- بە کورتبینیمان لە بابەتەکە، وا دەزانین کە گرفتەکەمان چارە کردووە، لە کاتێکدا بەو کارەمان لە ئایندەدا، گرفتی زۆرترو گەورەتر بۆ خۆمان دروست دەکەین.

هەندێجاریش بە هۆی ئەوەی کە بنەمای دورووست کارکردن، بەلاوە دەنێین، وای بۆ دەچین کە دەتوانین لە بارودۆخی جیاوازدا، بە ڕەوشو ڕێکاری جیاکار بکەین، وەك: بەسەرهاتی ئەو کاپتنەی کە شەوێك لە دەریادا، ڕووناکییەکی بینی، کە لە ڕواڵەتدا بە ڕووناکی کەشتییەکی دیکە بوو لە بەرامبەریدا، بۆیە کاپتنی کەشتییەکە پەیامێکی نارد کە «تکایە ئاڕاستەکەت بگۆڕە»، دەستبەجێ وەڵام هاتەوە کە «تکایە ئێوە ئاڕاستەکەتان بگۆڕن»، دووبارە کاپتنی کەشتی پەیامی نارد کە «ڕێڕەوەکەتان بگۆڕن»، دیسان وەڵام درایەوە، کە «ئێوە ڕێڕەوەکەتان بگۆڕن»، ئەم جارە، کاپتن بە توڕەییەوە پەیامی نارد کە «من کاپتنی کەشتییەکی گەورەم، دەستبەجێ ئاڕاستەکەت بگۆڕە»، وەڵام هاتەوە کە «من فانۆسی دەریام». بەڵێ، بنەماکان وەك «فانۆسی دەریا»کان وەهان. ئەوان ناجوڵێنو ئاڕاستەیان ناگۆڕێت. ئێمە ناتوانین ئەو بنەمایانە تێك بشکێنین، مەگەر ئەوەی کە بمانەوێت کەسایەتی خۆمان بشکێنین. چونکە کاتێك کە یاسا ئەبەدیو مەعنەوی و مرۆییەکان بەلاوە دەنێین، ئەوا پێ بە بوونی خۆماندا دەنێین، خۆمان تێك دەشکێنین.

دورووست کارکردن، بە بڕیاری هۆشیارانە، دەست پێدەکات، ئێمە هەموو ڕۆژێك، لە هەموو ساتە وەختێکدا، لەگەڵ دوو بژاردەدا، ڕووبەڕوو دەبینەوە، کە ئەویش هەڵبژاردەی ڕاستو هەڵبژاردەی نادرووستە. ڕێی سەرکەوتنیش، هەمان ئەو ڕێگە باریکو دورووستەیە، لە نێوان دوو ڕێیانی ڕێگاکاندا. ڕۆژانە دەکەوینە سەر ڕێگای دەیان ڕێگا، کە هەندێ لەو ڕێگایانە ئاخنراوە؛ لە داوی ژەهراوی بە ڕواڵەت بریقەدار، بۆیە ئێمە تەنها بەو هۆشیارییەمان، کە سەرچاوەی گرتبێت بە پابەندبوونمان بە دورووستکارییەوە، دەتوانین لە کەوتنە نێو ئەو داوانەوە، خۆ بپارێزین.

نادرووست کارکردن، دەرگاکانی تواناو هەلەکانمان بە ڕوودا دادەخاتو ڕۆژ بە ڕۆژ، سنووردارتریان دەکات. دورووست کارکردنیش، دەرگاکانی سەرکەوتنی ڕاستەقینەی بەردەوامممان بۆ ئاوەڵا دەکات، بۆیە وتراوە: ناوی دیکەی دورووستکاری ئازادییە، یەکسانە بە ئازادی کارکردن. هەروەها وتراوە: «یەکێك لە باشترین ئەو کاتانەی کە دەتوانیت مرۆڤەکانی تێدا باشتر بناسیت، کاتێکە کە بەڕێوەبەری کارەکەیان، لەوێ نەبێت، یان کاتێکە، وا بزانن کە کەس ئاگاداری کارەکەیان نییە». بۆیە ئەم هەفتەیە سەرنج بدەو بزانە:-

١- کاتێك کە بەڕێوەبەر ئامادە نییە، هەر بەو جۆرە کاردەکەیت، کە دەبێت ئەنجامی بدەیت؟ یان کاتێك کە باوكو دایکت لەوێ نین؟ یان کاتێك کە منداڵەکانت نایبینن؟ یاخود ئەگەر هاوسەردارێتو لەگەڵ یەك نین؟

٢- ئایا لەناو خەڵکدا، هەر ئەو کەسەی کە لە کاتی تەنیاییی خۆتدا دەبیت؟

٣- ئەگەر کارەکەت سوودێکی بۆت نەبێت، ئایا دیسان هەر بەو جۆرە، بەباشی لەگەڵ خەڵکدا ڕەفتار دەکەیت؟

٤- خۆت ڕابهێنە، کە هەر ڕۆژێکی هەفتە، درۆیەکی بچووکی «بێ زیان» بەلاوە بنێیت.

٥- سەرنج بدەو بزانە، کە سەنگو پێوەرێکی جێگیرت، بۆ پابەندبوون بە یاسا مەعنەوییەکانەوە هەیە، یان نا، بەپێی بارودۆخەکە بڕیار دەدەیت؟

بزانە کە دانە دانەی هەڵسوکەوتەکانمان، لە بچووکەوە، تا گەورە، جارێکی تر بەرەو ڕووی خۆمان دەگەڕێتەوە، ئێمە هەمیشە، بە جۆرێك لە جۆرەکان، باجی جێبەجێنەکردنی یاسا ئەبەدییە مەعنەوییەکان دەدەین. بۆیە ئەم هەفتەیە، بڕیار بدە، کە بە دورووستییەکی زیاترەوە کاربکەیت. دورووستکاری هەستێکی باشمان پێدەدات، هەر ئەو هەستە باشەیە، دەبێتە هۆی سەرکەوتنمان. هەر بۆیە سەرکەوتنمان، لە پابەندبوونمانە بە دورووستکارییەوە.



# سەرانە _ الإتاوة _

لە زمانەوانیدا، سەرانە، واتە خەراج "کرێی زەوی"، یان بەرتیل، لە زانستی داراییی نوێدا بریتییە لە: بڕێ پارە، بە زۆر، لە خاوەن خانووبەرە وەردەگیرێت، بەرانبەر ئەو سوودەی لە خزمەتگوازیی گشتی دەوڵەت، یان دەزگا خۆجێییەکان، کە خاوەن خانووبەرە، یان خاوەن پڕۆژەیەك کەڵکی لێدەبینێت. بۆ نموونە: زۆربەی کات، پڕۆژەی نیشتەجێبون، یان خانوو، نرخیان بەرزدەبێتەوە، کاتێك حکوومەت، ڕێگاوبانو خزتمەتگوزاری، ببات بۆ ئەو جێگایانە، یان تۆڕی ئاو، یاخود تۆڕی کارەبا، بگەیەنێتە ئەو شوێنانە.

زۆرجار، بە سەرانە دەوترێت: باجی چاککاری، یان باج بەرانبەر چاککردنی ئەو کارانەی حکوومەت پێی هەڵدەستێت، بە مەبەستی پێشخستنی شارەکان، یان گەیاندنی خزمەتگوازی گشتی، بۆ ئەو شوێنانە.

**سەرانە لە چەند ڕوویەکەوە، جیایە لە باج، گرنگترینیان:-**

سەرانە بەرامبەر سودێکە، دەتوانرێت پێوانە بکرێتو هەڵناکشێت، "واتە زیاد ناکاتو بڕەکەی جێگیرو دیاریکراوە"، تەنها لەگەڵ سوودی تایبەتیدا دەگونجێت، "واتە ئەو بڕە پارەیە، تەنها لەو کەسو لایەنانە وەردەگیرێت، کە سوودێکی تایبەت وەربگرن، لە خزمەتگوزارییە گشتییەکانی حکوومەت، یان دەسەڵاتە ناوچەییەکان"، بەڵام نرخی باج، بە گوێرەی بڕی ئەو پارەی کاری پێدەکرێت، زیاد دەکات.

لەگەڵ ئەوەی سەرانەو میرانە (رسم)، لە زۆر ڕووەوە لەیەکدەچن، چونکە هەردووکیان بەرانبەر بە خزمەتگوزارییەك دەدرێن، کە حکوومەت دابینی دەکات، بەڵام جیاوازییەکەیان لەوەدایە، سەرانە بەرانبەر خزمەتگوزارییەك دەبێت، کە شێوەیەکی ناوچەییو شێوەی بەرجەستە، لەخۆ دەگرێت، زۆربەی کات، یەکجار ئەو بڕەپارەیە، وەك سەرانە دەدرێت، یان وەردەگیرێت، بەڵام میرانە؛ بەرانبەر خزمەتگوزارییەك دەبێت، شێوازێکی نەتەوەیی لەخۆ دەگرێت، هەرکات خزمەتگوزارییەکە دووبارە بووەوە، میرانەکە وەردەگیرێت، واتە بەشێوەیەکی خولاو، میرانە لە هاوڵاتیان دەسەنرێت"، بۆ نموونە: هاوڵاتیان لە ساڵێکدا چەندجار کاریان بە فەرمانگەی دادنووس بکەوێت، بەرانبەر ڕاپەڕاندنی کارەکانیان، ئەوەندەجار ڕسوماتیان لێوەردەگیرێت".

لەبنچینەدا، وشەی سەرانە، واتە مافی خاوەندارێتی پارچە زەوییەك، کە ناگوێزرێتەوە بۆ کەسێکی دی، مەگەر دەقێکی یاسایی لە حکوومەتدا، بڕیار لەسەر ئەو خاوەندارێتییە بدات، بەڵام لەم ڕۆژگارەی دواییدا، سەرانە بەو بڕە پارەیە وتراوە، کە خانەی پەخشو بڵاوکردنەوە، بەرامبەر هەر نوسخەیەك لە دانراوەکەی وەك مافی دانەر ((CopyRight)) داویانە بە نووسەر، یان ئەو بڕەپارەیە، کە دەدرا بەخاوەن کانەکان"، وەك کانی خەڵوزو بەرد" بەرانبەر بەکارهێنانی ئەو کانە، لەلایەن بەکارهێنەرانییەوە.



# سوودەکانی زەنجەفیل

زەنجەفیل بەرهەمێکی ڕووەکی زۆر بەسوودە لە بنەڕەتدا وەك بەهارات بۆ ناوخواردن بەکاردێت، بەڵام ئەو لێکۆڵینەوانەی لەسەری کراوە زۆر سوودی تری دەردەخات، کە وەك هۆکاری یارمەتیدەر بۆ چارەسەری هەندێ نەخۆشی دەست دەدات، یان پاراستن لە تووشبوون بە هەندێ نەخۆشی، وەك شێرپەنجەو شەکرە.

ئەم ڕووەکە سوودی تەندروستی هەیەو ڤیتامینەکانی وەك (A, C, E, B) سەرەڕای ئەوەی زۆر دەوڵەمەندە بە مەگنیسیۆمو فسفۆرو پۆتاسیۆمو سلیکۆنو سۆدیۆمو ئاسنو کالیسیۆمو بیتاکارۆتین، تایبەتمەندی دژە تەنی تێدایە بۆ نموونە دژەتەنی کەڕوو، هەوکردن، بەکتریا، ڤایرۆس، گرنگترینی ئەو سوودانەی لە زەنجەفیل دا هەیە بریتین لە:-

یەکەم: سوودی زەنجەفیل بۆ ئەوانەی نەخۆشی شەکرەیان هەیە.. ئەوانەی بە دەست نەخۆشی شەکرەوە دەناڵێنن دەتوانن سوود لەم بەرهەمە وەربگرن، چونکە ئاستی شەکر لە خوێندا دادەبەزێنێ، پزیشکەکان هەمیشە ئامۆژگاری نەخۆشەکانیان دەکەن بەیانیان بە خواردنی یەك کوپ زەنجەفیلی کوڵاو بە مەرجێك فرێش بێت نەك هاڕاو.

دووەم: نارێکی کاری گەدە لادەبات:- تایبەتمەندی زەنجەفیل لە دەرکردنی غازاتی ناو گەدە وای لێ دەکات لە باشترینی ئەو ڕووەکانە بێت کە یارمەتی نەهێشتنی نارێکی کاری گەدە دەدەن، هەروەها یارمەتی حەوانەوەی ماسولکەکانی گەدەو ڕیخۆڵەکان دەداتو غازات ناهێڵێ، شارەزەیان زۆربەی کات بۆ چارەسەری نەخۆشی بەد هەرسیو ئەو بەکتریایانەی دەبنە هۆی سکچوون زەنجەفیل بەکار دەهێنن.

سێیەم: یارمەتی تەندرووست بوونی دڵ دەدات:

زۆر بەسوودە بۆ دڵ بە تایبەتی:

* یارمەتی دابەزینی ئاستی کۆلیسترۆڵ لە خوێن دەدات.

* یارمەتی نەمەینی خوێن دەدات، ئەوەش پارێزراویی دەکات لە زۆرێك لە نەخۆشییەکانی دڵ.

* بەهۆی ئەو ڕێژە زۆرەی مەنگەنیزو پۆتاسیۆم تێیدا بە باشترین ئەو هۆکارانەی بۆ تەندروستی دڵ هەیە دادەنرێت.

چوارەم: ڕێگرە لە تووشبوون بە ئەنفلوەنزا.. یەکێ لە سوودە سەرسوڕهێنەرەکانی زەنجەفیل ئەوەیە ئامێری بەرگری بەهێز دەکات لە ڕێی هاندانی عەرەقکردنەوە هەربۆیە بۆ ئەو مەبەستە وەك چارەسەری سروشتی بەکاردێ، هەروەها بۆ سووك کردنی نیشانەکانی سەرما بوون دەتوانرێ پارچەیەك زەنجەفیل بکوڵێنرێو ئەو هەڵمەی لە ئەنجامی کوڵانەکەوە دروست دەبێت هەڵمژرێت، یان ڕۆژانە خواردنەوەی سێ کوپ لە ئاوێك کە زەنجەفیلی تێدا کوڵا بێت. سەرەڕای تایبەتمەندی دژە ژەهراوی بوون!

پێنجەم: پاراستن لە نەخۆشی شێرپەنجە: دەکرێت لە چارەسەری شێرپەنجەی هێلکەدان بەکاربێت، بە پێی ئەو لێکۆڵینەوانەی لە زانکۆی میشیغانی تایبەت بە شێرپەنجە سەلمێنراوە هاڕاوەی زەنجەفیل دەبێتە هۆی مردنی خانە شێرپەنجەییەکانی هێلکەدان، هەروەها بە پێی لێکۆڵینەوەکانی زانکۆی مینیسوتا زەنجەفیل گەشەی خانە شێرپەنجەییەکانی کۆڵۆنو ڕێکە هێواش دەکاتەوە. هەروەها هەڵدەسێ بە لەناوبردنی چەند جۆرێك لە خانە شێرپەنجەییەکانی وەك سییەکان، شێرپەنجەی مەمك، پێستو پرۆستاتو پەنکریاس.

شەشەم: کەم کردنەوەی ئازاری سوڕی مانگانە، بە پێی ئەوەی تایبەتمەندیی دژە هەوکردنو ئارامبەخشی تێدایە دەتوانرێت بۆ نەهێشتنی ئازاری سووڕی مانگانە بەکاربێت، ئەو ئافرەتانەی ئازاریان هەیە لەو کاتانەدا دەتوانن هاڕاوەی زەنجەفیل، یاخود کەپسولی زەنجەفیل وەك چارەسەری سروشتی بۆ نەمانی ئازار بەکاریبهێنن. ئەویش بە خواردنەوەی بڕێك لە زەنجەفیلی کوڵاو!

حەوتەم: نەهێشتنی دڵ تێکەڵهاتنی بەیانیان:-

زەنجەفیل هاوشێوەی ڤیتامین $B_6$ کار دەکات لە نەهێشتنی نەهێشتنی دڵ تێکەڵهاتنی بەیانیان بۆ ئەو ئافرەتانەی دووگیانن، باشترین ڕێگەش جوینی زەنجەفیلە ئەگەر بتوانێت.

هەشتەم: کەمکردنەوەی ئازاری هەوکردنی جومگەکان:-

سەرەڕای سوودی بۆ کەمکردنەوەی ئازاری هەوکردنی جومگەکان، هەروەها بەکاردێت لە چارەسەری ئەو ئازارەی بەهۆی باداریو ڕۆماتیزمو هەوی جومگەکانی ئەژنۆ، ئەویش بە بەکارهێنانی مەعجونی زەنجەفیلی گەرم لەگەڵ زەردەچەوە بۆ شوێنی ئازارەکە ڕۆژانە دووجار.




# متمانە بەخۆبوونو داهێنان

**بە گشتی خەڵکی لە دوو گروپ پێکهاتوون:-**

گروپێکیان، دەیانەوێت بە نەکردنی کارەکان دوور بکەونەوە لە زیانەکانو قازانجیان دەست بکەوێت، ئەگەرچی کەمیش بێت، گروپەکەی دیکەیان، دەیانەوێت بە کردنی کارەکان، قازانجیان دەست بکەوێت!

**گروپی یەکەم..** زۆر کەم، تووشی زیان دەبن، بەڵام هەرگیز بەرەو پێش ناچنو گەشەیەکی خێراو بەرهەمدار، لە ژیانیاندا بە چاوی خۆیان نابینن، کە لە سەردەستی خۆیان ئەنجام درابێت.

**گروپی دووەم..** زۆرجار تووشی شکستو زیانو دۆڕانو کەوتن دەبن، بەڵام تەواوی پێشکەوتنەکانی دونیا، بەدرێژایی مێژووی مرۆڤایەتی، لەسەردەستی ئەوان ڕوویداوەو ڕوو دەدات.

کەواتە: با لێرەدا واز لە گروپی یەکەم بهێنین، دەچینە لای گروپی دووەم، گروپی دووەمیش دەبنە دوو بەش:-

* بەشی یەکەمیان، کاری دووبارەو تەقلیدی دەکەن، کاردەکەنو دەجووڵێنو ماندوو دەبن، بەڵام جووڵەیەکی میکانیکیی ئامێرئاسا، کە ناتوانو بۆیان ناکرێت، هیچ داهێنانێك ئەنجام بدەن.

بەشی دووەمیان کاردەکەن، بەڵام کاری نوێو داهێنەرانە، زۆرجار پێچەوانەی ڕەیڕەوی ڕووباری کۆمەڵگا، مەلە دەکەن، تەنانەت لە زۆر کاتدا، کۆمەڵگا بە ئاسانی، ئەمانەی پێ قبوڵ ناکرێت.

بەڵام لە واقیعدا، ڕۆحی پێشکەوتنی کۆمەڵگاو شارستانییەتەکانن، ئەمانە زۆر بە دوای ئەو کارانەدا ناچن، کە تاقیکراونەتەوە، قازانجیان مسۆگەرو دیاریکراوەو بێمەترسییە.

حەزیان لە کارێکە، با مەترسیشی تێدا بێت، بەڵام بڕی قازانجەکەی دیاریکراو نەبێت، لەبەرئەوە ئەم کارانەش ئەنجام دەدەن، بەو ئومێدەی قازانجی خەیاڵی بکەن.

یەکێك لە هۆکارەکانی قەدەغەکردنی سو(ڕیبا)، ئەوەیە کە قازانجەکەی مسۆگەرو دیاریکراوو بێمەترسییە!!

بەڵام بازرگانی، قازانجی مسۆگەر نییەو دیاریکراویش نییە، هەروەك چۆن، بەردەوام بازرگان، بە هیوای قازانجکردنە، هەرواش بەردەوام، ترسی زەرەرو زیانی هەیە، هەروەك خودای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَتِجَـٰرَةٌ تَخْشَوْنَ كَسَادَهَا ﴾ التوبة: ٢٤.

کەواتە: گرنگە بۆ ئێمە بڕیار بدەین، دەستپێشخەرو داهێنەر بین، نەك بەردەوام، دواکەوتوو، چاولێکەر بین.

کوردەواریی خۆمان، چەندە جوانیان گوتووە: (**کردە پەشیمان بە، نەك نەکردە پەشیمان**) دەبێ ترس لە شاری ڕۆحماندا شاربەدەر بکەین، بۆ ئەوەی بتوانین کارە نەکراوەکان، ئەنجام بدەین، هەتا لە سەر تەختی دڵمان ترس دانیشێ، ناتوانین هەنگاوهەڵگرینو بستێك بچینە پێشێ.

ترس ڕەوشتێکی ناشیرینو خراپە، بەڵام خۆپارێزی (حەزەرکردن)، ڕەوشتێکی جوانو باشە، کێشەی گەورە ئەوەیە، نێوانی ئەم دووانە تەنها تاڵە موویەکە، کەسی زیری دەوێت، ئەو سنورە بە درووستی، دەستنیشان بکات.

ئەگەر لە ڕەخنە بترسیت، دەبێ هەرگیز نەنووسیت.. گەر لە زەرەر بترسیت، دەبێ هەرگیز بازرگانی نەکەیت.. **گەر لە کەوتن بترسیت، دەبێت هەرگیز بەڕێدا نەڕۆیت، ئەو کات دەبێت هەر بە سنگەخشکێی منداڵی بەڕێدا بڕۆیت..** گەر لە پێکدادان بترسیت، دەبێت هەرگیز شۆفێری نەکەیت، نابێت بترسیت، بۆئەوەی فێربیت، بەڵام دەبێ خۆت بپارێزیت (حەزەر بکەیت) بۆئەوەی کەمتر تووشی زیان ببیت!

بناغەی متمانەبەخۆبوونیش هەر ئەمەیە، مرۆڤ بە ڕادەیەك متمانەی بە خۆی هەبێت، ساتێك قەناعەتی لە سەر شتێك یەکلادەبێتەوە، دوای بیر لێکردنەوەو ڕاوێژ لەگەڵ کەسانی شیاوو پسپۆڕ لەو بوارەدا، با بە تەنیاش بێت، دەبێت نەترسێتو دەست پێبکات. ﴿ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ﴾ آل عمران: ١٥٩.



# خۆپاراستن لە نەخۆشییە باوەکان

ڕۆشنبیری تەندروستی!

## یەکەم:- نەخۆشیی خوێنبەرەکانی دڵ: ٢/١

ڕۆژێک تێپەڕ ناکاتو لاوێک لە سییەکان، یان چلەکانی تەمەنیدا نەهێنرێت، بۆ هۆبەی چاودێریی وردی نەخۆشییەکانی دڵ(ICU)، بە هۆی توشبوونی بە جەڵدەی دڵ، تێکچوونی دیواری پێشەوەو خوارەوەی دڵی، ئەمەش بارێکی نائاسایی، بۆ دڵ دروست دەکات، ڕەنگە چاک ببێتەوەو ڕەنگە چاکیش نەبێتەوە!

جەڵدەی دڵ، لە ئەمریکاو ئەوروپادا، یەکەمین هۆکاری مردنە. ئەم نەخۆشییە، ئەوەندە بڵاوە، سنووری نەخۆشییە درمەکانی تێپەڕاندووە، بە جۆرێک لە ڕابــردوودا، تەنها لە سییەکانو چلەکانی تەمەندا دەبینرا، وەلێ ئێستا، ڕۆژانە چەند نەخۆشێک دەبینین لە سییەکان، یان چلەکانی تەمەنیاندان، تەنانەت هەندێ کات، بیستەکانیشی تێدایە!

**نەخۆشی خوێنبەرە تاجییەکانی دڵ (Coronary Artery Disease)** لە ئەنجامی تەسکبوونەوە، یان گیرانی خوێنبەرە تاجییەکان، ڕوودەدات. ئەم خوێنبەرانەش کاتێک دەگیرێن کە چەوریی، یان خوێن مەیینیان تێدا کۆببێتەوەو ڕێگریی لە هاتوچۆی خوێن بکەن.

**١- ئەم نەخۆشییە، بە دوو شێواز خۆی نیشان دەدات:-**

**أ- سنگەکوژێ (الذبحة الصدرية _ Angina Pectoris):-** لەمبارەدا نەخۆش هەست بە ئازارێکی زۆر دەکـات، لە کاتی ماندووبووندا، بە ڕەوینەوەی ماندوویەتییەکەی، ئازارەکە لا دەچێت. ئەمەش کاتێک ڕوودەدات، کە ماسولکەکانی دڵ، نەتوانن بڕە ئۆکسجینی پێویستیان دەست بکەوێت.

**ب-جەڵدەی دڵ (Heart Attack):-** ئەمە کاتێک ڕوودەدات، کە یەکێک لە خوێنبەرە تاجییەکانی دڵ بگیرێت، بە کڵۆیەک لە چەوریی، یان خوێنمەیین، بە جۆرێک ڕێ نـەدات، کە خوێن هاتوچۆ بکات، بەمەش بەشێک لە ماسولکەی دڵ، وێران دەبێت. توێژینەوەکان دەریانخستووە، کە لە (٨٥٪)ی ئەوانەی لە خوار چل سالییەوە تووش دەبن، لە جگەرەکێشانن!

زۆربەی جار (جەڵدەی دڵ)، یەکەم دەرکەوتەی (نەخۆشی خوێنبەرە تاجییەکانی دڵ)ە، ئەگەر لەپێش ئـەوەدا، ئازارێک لەسنگیدا نەبووبێت، لە کاتی ماندووبووندا (ئەوەی پێی دەڵێین سنگەکوژێ)، کە ئەمە وەك زەنگێکی ئاگادارکردنەوە وایە، تاکو نەخۆشەکە، پشکنین بۆ خۆی بکاتو چارەسـەر وەربگرێت، بەمەش ناگاتە جەڵدەی دڵ.

بە هۆی ئەوەی لە (٨٠٪)ی ئەوانەی جەڵدەی دڵیان، لە کاتێکی زوودا تووشبووە، بڕی چەوریی لە خوێنیاندا زۆرە، پزیشکەکان ئاگاداری ئەو کەسانە دەکەنەوە، کە تووشی جەڵدەی دڵ بوون، لە تەمەنی لاویدا، پشکنین بۆ منداڵەکانیان بکەنو لە بڕی چەوری لە خوێنیاندا، دڵنیا ببنەوە، ئەوەی لە ئێستادا کەمتەرخەمی بکات، ئەوە لە داهاتوودا باجەکەی دەدات!

**٢. ئەو هۆکارانەی ڕوودانـی نەخۆشی خوێنبەرەکانی دڵ، زیاتر دەکەن:-**

**أ- جگەرەکێشان:-** کارتێکەرێکی زۆر مەترسیدارە، بەشێوەیەکی بەرچاو، دەبێت بە هۆی جەڵدەی دڵ لای لاوان، هەر جگەرەیەك کە دەیکێشیت، ئەگەری تووشبوون بە جەڵدە، سێ هێندە زیاد دەکات. تەنانەت ئەم کاریگەرییانە، بۆ هاوسەرەکانیانو نەوەکانیان دەگوازرێتەوە.

ئەگەر گەنجان دەیانەوێت، لەم مەترسییە بەدوور بن، ئەوا هەر ئەمڕۆ، واز لە جگەرە بهێننو دوای مەخەن بۆ سبەی.

**ب- بەرزبوونەوەی کۆلیسترۆڵی خوێن:-** ئەمە زۆر باوە لای لاوانی توشبوو بە جەڵدە، لەبەرئەوەی تا بڕی چەوری خوێن بەرزتر بێت، مەترسیی توشبوون بە جەڵدە زیاتر دەبێت. توشبوو، پێویستە شوێن سیستەمێکی خۆراکیی کەمچەوری بکەوێت، کە پزیشك بۆی دیاری دەکات، هەروەها پێویستە دەستی یارمەتی بۆ منداڵەکانیان ڕابکێشنو پشکنینیان بۆ بکەنو لە بڕیی چەوری لە خوێنیاندا دڵنیا ببنەوە، هەروەها سیستەمی ژیانی منداڵەکانیان بگۆڕن؛ لە ڕێی زاڵبوون بەسەر بڕی چەوری لە خواردنەکانیانداو ئەنجامدانی جۆرێك لە وەرزشو چالاکیی جەستەیی...

بە یارمەتی خودا، لە ژمارەی داهاتوودا، هۆکارەکانی دیکەو چارەسەرەکانیان باسدەکەین..




ن: د.حسان شمسی پاشا
و: یەحیا محەممەد عەلی

# زۆری بەبێ زۆر!

دەگێڕنەوە: ڕۆژێك چەرچڵی سەرۆکوەزیرانی بەریتانیاو ڕووزفێڵتی سەرۆکی ئەمریکاو ستالینی سەرۆکوەزیرانی ڕووسیا، لە تارانی پایتەختی ئێرانو لەپاش کۆبوونەوەی یەك لەدوای یەك، بۆ خواردنی نانی شێو، پێکەوە دانیشتبوون.. لەپاڵ مێزی دانیشتنەکەیاندا، یەکێك لە سەگەکانی چەرچڵ، هەڵنیشتبوو؛ سەیری ئەوانی دەکرد. چەرچڵ ڕووی قسەی، لە هاونشینەکانی کردو گوتی: بەچ شێوەیەك، دەکرێت ئەم ساسە کەسکوونو توونە، دەرخواردی ئەم سەگە بدرێت؟

ڕووزفێڵت گوتی: "من شارەزای ئەو کارەم." پاشان پارچەیەك گۆشتی لەت کردو تۆزێك ساسی لە بەشی ناوەوەی پارچە گۆشتەکە هەڵسوو، بەرەو لای سەگەکە ڕۆیشتو گۆشتەکەی لای دەمی سەگەکەوە گرتو مڵچەمڵچی بۆ کرد، سەگەکەش بۆنی بە گۆشتەکەوە کردو دەستیکرد بە خواردنی، تا دەمی بە ساسە توونەکە گەیشت، ساسەکە ئاوری لە دەمی بەرداو کزاندییەوەو خۆی لە خورادنی بوارد.

پاشان سەرەی ستالین هاتو گوتی: هیچ کارێك بە زمانی شیرینو قسەی خۆش، ناچێتە سەر، جا بە پەنجەکانی، برێك ساسە توونەی هەڵگرتو بەرەو لای سەگی بەستەزمان ڕۆیشت، بە دەستێکی، ملی سەگەکەی بەتوندی گرتو بە دەستەکەی دیکەی، هەر بەزۆر، ساسەکەی هاویشتە ناو دەمی سەگە داماوەکەوە، سەگەکە، بە زەبری زۆری خۆی، خۆی لە دەستی ستالین ڕاپسکاندو خۆی ڕزگارکرد، دەستیکرد بە تفکردنەوەی ساسە توونەکە.

لە کاتێکدا "چەرچڵ" پێکەنینی بە هەردووکیان دەهات، گوتی: " دۆستانی من، هەردووکتان، زۆر زۆر لە هەڵەدان! ئێوە دەبێت، کارێك بکەن؛ سەگەکە بۆ خۆی، ناچار بە خواردنی ساسە توونەکە بکەن."

ڕووزفێڵت گوتی: جا ئەوە چۆن دەبێت؟

چەرچڵ گوتی: "سەیر بکەن، بزانم چی دەکەم"، پاشان لە جێی خۆی هەستایە سەر پێو بە چوار پەنجەی، تۆزێك ساسەکەی لە پاشەڵی سەگی بێچارە، هەڵسوو، سەگەکەش، کە لەتاو دەردی خۆی، بە نووزە نووز، بە دەوری خۆیدا، پێچی دەخوارد، دەستی بە لێسانەوەی ساسە توونەکە کرد!"

ئەمجا چەرچڵ گوتی: بینیتان، چۆن دەتوانیت، بەبێ زۆرلێکردن، هەر بەزۆر، کارێك بەسەر خەڵکیدا. دەسەپێنیت!"

کاریگەری ئەم چیرۆکەو ڕەنگدانەوەی لە واقیعی ئەمڕۆماندا، بۆ تۆی خوێنەری بەڕێز جێ دەهێڵین.





# خانووی لمینو دروستکردنی نیشتیمان

کاتژمێر ١٠ی شەو بوو، کوڕە بچووکەکەم، داوای خوێندنەوەی چیرۆکێکی لێدەکردم، بۆئـــەوەی بەدەم خوێندنەوەی چیرۆکەوە خـــەو بیباتەوەو چاوەکانی لێك بنێت، منیش ئەم جارە ویســـتم چیرۆکێکی جیاواز لە جارانی پێشـــووی بۆ بخوێنمەوە، بۆئەوەی بتوانێت سوودی لێوەربگرێتو لە ژیانیدا پەیڕەوی بکات.. پەڕاوی یادگارییەکانـــم هێناو دەســـتم کرد بە خوێندنـــەوەی یەکێك لە یادگارییەکانم:

بـــەرواری ١٩٨٧/٥/١٨، تەمەنم ١٠ ســـاڵان بـــوو، دەوروبەری کاتژمێـــر (٤)ی پـــاش نیوەڕۆ دەبـــوو، کە منو باپیـــرەم، چوینە کەنـــار دەریا، من بۆ تێڕامان لە ژیانو باپیرەشـــم بۆ پشـــوو لە ماندووبوونـــی تێڕامانـــەکان چوویـــن، باپیـــرەم ئارامییەکی زۆر ســـەیری پێوە دیاربوو، دیاربوو کە ساتێکی ئارامو بێبیرکردنەوە بەسەر دەبات، بەدیار وێنەی شـــەپۆلەکانی دەریاو ڕەنگی ئارامی ئاســـمانو دەنگی ناســـکی شـــەپۆلەکان، ئەو هێندە سەرسامی ئەو سرووشـــتە بووبوو، بە جۆرێـــك کەوتبووە ناو دونیـــای فراوانی خەیاڵەوە، کـــە نەیدەزانی لە دەوروبەریدا، چی هەیە، هەرچەند ســـەیری شـــەپۆلەکانی دەریاکەی کردبـــا، زیاترو زیاتـــر، ئارامی بەرووخسارییەوە دەبینرا.

منیـــش خەریکی دروســـتکردنی خانوویەکـــی بچووك بووم، لـــە لمی قەراغ دەریاکـــە، پاش چەند ســـاتێكو خەریکبوونم بە خانووەکـــەوە، لە کۆتاییدا خانوویەکی بچووکی جوانم درووســـت کـــردو زۆر پێی دڵخۆش بووم، بەردەوام ســـەیرم دەکردو وێنەیم دەگـــرت، لە ناکاو شـــەپۆلێکی دەریا هـــاتو خانووەکەمی لەگەڵ خۆیـــدا بـــرد، من زۆر دلگران بووم، هەر لەســـەرەتای چوونم بۆ ئەوێ، خەریکی ئەو خانووە بووم، زۆر دڵتەنگ بوومو لە بێزاریدا دانیشـــتمو نەمدەزانی چی بکەم، پاش کەمێك باپیرەم هات بۆ لامو دەستی خستە سەر شانمو لە تەنیشتمەوە دانیشت، وتی: بۆچی ئاوا بە دڵتەنگی دانیشـــتوویت، بیر لە چی دەکەیتەوە؟ پێم وت:



# پەلە مەکە!!

و: شادی مەلا عومەر

پیاوێك لە یەکێك لە قاوەخانەکانی فەڕەنســـادا، دانیشـــتبوو، بەردەوام سەیری پەرداخە شەربەتەکەی بەردەمی دەکرد، ماوەی نیـــو کاتژمێر بوو، بـــەردەوامو بـــێ چاوتروکان، بـــۆ پەرداخە شـــەربەتەکەی بەردەمـــی خۆی دەڕوانـــی! لەو کاتەدا شـــوفێری لۆرییەك، بەپەلە خـــۆی کرد بە قاوەخانەکەدا، دیاربوو پیاوێکی خۆشـــدوو ســـوعبەت چی بوو، لـــە نزیك کابراوە دانیشـــتو بە پەلـــە پەرداخە شـــەربەتەکەی هەڵگرتو دەمـــی پێوەنا، بە یەك جـــار خواردییەوە، لەو کاتەدا کابرای بەرامبەری دەســـتیکرد بە گریان!!! شوفێری لۆرییەکە وتی: هاوار بۆ تۆ ئەی پیاو، من وەك

باپیرە بۆچی ئەو شەپۆلانە، بەردەوام دێنو دەچنو شەپۆلەکانی تر دادەپۆشن؟ هەندێجار خانووە لمینەکان ڕادەماڵن، هەندێجاریش نامەی ناو شوشە داخراوەکان لەم سەری دنیاوە بۆ ئەو سەری دنیا دەگوازنەوە؟! یان ملوانکەی ئەو کیژۆڵەیەی کە بە دڵخۆشییەوە یاری دەکات، ونی دەکاتو ڕەنگە هەرگیز پێی نەبەخشێتەوە، لەوانەشە پاش چەند ساڵێکی تر، وەك دیاری بیبەخشێتەوە بە خۆی! هەندێجار دڵخۆشی دەبەخشێت بە مرۆڤەکانو دەتوانن یاری لەگەڵدا بکەن، هەندێجاریش دەیانکات بە ژەمێکی خۆیو ئازاریان دەدات.. من سەر لەم کارانەی دەریا دەرناکەم؟؟!!

باپیرەم، بەو پێیەی کە دنیادیدە بوو، خەندەیەکی کردو وتی: کوڕی شیرینم.. کاتێك بە گەنجی دەهاتمە ئێرە، هەروەك تۆ، بیرکردنەوەکانم منیان بەرەو ناخی دەریاکە دەبرد، نەمدەزانی؛ دڵتەنگ بم بۆ ئەو بەشە ئاوەی، کە لە ژێرەوە بە مردوویی ماوەتەوەو هیچ ڕێگەیەك نییە، هەتا دنیای دەرەوە ببینێو بە ئازادی سەما بکەن بە شەپۆلەکانیان، یان دڵخۆش بم؛ بۆ ئەو بەشەی کە ئەو دیمەنە جوانەی بە سرووشت بەخشیوەو بۆتە هۆی ئارامبەخشی مرۆڤەکان، ئەمە ئەو دوو هەستە جیاوازە بوو، کە من لەو کاتەدا هەمبوو بۆ دەریاکە، بەڵام لە کۆتاییدا، ئەگەر بە پێی لۆژیك تێڕوانینی بۆ بکەین، ئەگەر بەشە مردووەکە نەبێت، زیندووەکەش ناتوانێت لە سەرەوە، بەو ئازادییە بێتو بچێت، ئەمە یاسای سرووشتە، هەروەك چۆن، لەسەر ئێمەی مرۆڤیش پەیڕەو کراوە، ئێمە بۆ ئەوەی ئازادی ببەخشین بە کۆمەڵێکمان، دەبێت کۆمەڵێکی ترمان ببێت بە قوربانیو هەوێنی ئازادییەکە، لەسەر مەرگی ئەوان بنیات دەنرێت، هەرچەندە لە دەریادا جیاوازییەك هەیە، لەم لایەنەوە، بەشی ژێرەوەی ئاوی دەریاکان، دەبنە هۆکار بۆ ژیانی ماسیو هەموو زیندەوەرە ئاوییەکانو هەر لەوێدا جیهانێکی ترو ژیانێکی تریان درووست کردووە، بەڵام ئەو مرۆڤانەی، کە دەبنە قوربانی بۆ بەدەستهێنانی ئازادیی بۆ ئەوانی دیکە، لە ژێر خاکدا ژیانێکی تر درووست ناکەن، بەڵکو دەڕۆنە بەشی سەرووتر، لەو بەشەی کە تەنانەت مرۆڤەکانیش، لەسەری دەژین، ئەوان تەنها بە جەستە لە خوارەوەن، بە ڕۆح لە سەرەوەن، چونکە شایستەی ئەوەن لەسەرەوە بن! هەر لەبەرئەوەیە، کە شەپۆلە تازەکان دێنو کۆنەکان دەچنە ژێرەوە، سوڕی ژیان هەر بەم شێوەیە دەبێت..

کوڕم، ئەگەر خانوویەك، کەرەستەکەی بریتی بێت لە لم، ئەوا هەڵەی هیچ کەسێکی تێدا نییە، ئەگەر بە ئاسانی بڕووخێت! ئەو کەسانەی کە خانووی لمین دەکەنەوە، تەنها بۆ کات بەسەربردنەو بۆ ماوەیەکی کەمە، بۆیە دەریا زۆر بەئاسانی، بە شەپۆلێکی خۆی لەناوی دەبات، هەروەك ئێمە.. ئێمە ئەگەر خێزانەکانمان لەسەرەتاوە، بە لاوازی درووست بکەینو بنەماکەی بریتی نەبێت لە ڕێزو خۆشەویستی، ئەوا پایەکانی زۆر لاواز دەبێتو لە ناوەوە هێندە ناسك دەبێت، کە ڕەنگە بچووکترین کێشە لەناویان بباتو هەڵیان بووەشێنێت، لەناوبردنی ئێمە دەکەوێتە سەر ئەوەی، تا چ ڕادەیەك، بە بەهێزیی خۆمان درووست کردووە، کاتێك تۆوێك دەچێنیت؛ ئەگەر خاکەکەی بەهێزو گونجاو نەبێت، ئەوا هەرچەندە ئاوی بدەیت، گەشە ناکاتو کارێکی بێئەنجام دەکەیت، ئەگەر ئێمە نەبین بە کەرەستەو بناغەیەك بۆ درووستبوونی نیشتیمانێکی بەهێز، کە هیچ شەپۆلێك، نەتوانێت لەناوی بباتو دەستەکانی یەك نەگرین، ئەوا مەحاڵە بتوانین بڵێین: ئێمە نیشتیمانمان هەیە، ئەگەر هەشبێت، چەندان شەپۆلی ناحەزان ڕای دەماڵن، چونکە هەڵەکە، هی خۆمان بووەو نەمانتوانیوە؛ ببین بە هەوێنی درووستبوونی خاكو وڵاتێك، کە وەکو پۆڵا، بەهێز بێت.

هەموو شتێك، پەیوەستە بەوەی کە چۆن لە سەرەتاوە، بناغەیەکی بەهێز درووست دەکەین، بۆ ژیانمانو نەهێڵین شەپۆلەکان، کاریگەرییەکی ئەوتۆ بکەنە سەر ژیانمان، بێگومان هیچ شتێکیش، بەبێ قوربانیدان نابێت، پێویستە وەك ئاوی دەریا، قوربانی بدەین بۆ ئامانجەکانمان، هەتا بتوانین سوود بگەیەنین، من بۆ تۆ، تۆ بۆ کەسێکی ترو ئەویش بۆ کەسێکی تر.. بەم شێوەیە بناغەی خانووەکانمان دادەنێینو خانوویەك درووست دەکەین، کە ڕووپۆش کرابێت بە گوڵی ڕەنگاوڕەنگو هەمەجۆر، لە ناوەوەش بە پۆڵا، هیچ هێزێك ناتوانێت تێکی بشکێنێت.. هەمووو ئەمەش تەنها یەك پێناسەی هەیە (درووستکردنی نیشتیمانەکەم)...

ئەمە کۆتایی چیرۆکەکە بوو، کە سەرم هەڵبڕی؛ بینیم کوڕە بچووکەکەم خەوی لێکەوتبوو، دەزانم ئەمە کەمێك ئاڵۆزە، ئەو تێی بگات، بەڵام بیرهێنانەوەیەك بوو؛ بۆ خۆمو وێنەیەکی زیندووش بوو بۆ ئەو سەردەمەی کە تێیدا دەژیم، بۆیە دەڵێم سوپاس بۆ ڕۆحت باپیرە!

سوعبەتێك ئەوەم لەگەڵدا کردیت، ئێستا داوادەکەم پەرداخێك شەربەتی ترت بۆ بهێنن، تکا دەکەم من توانای بینینی فرمێسکی پیاوانم نییە!! کابرا وتی: من بۆ پەرداخە شەربەتەکە ناگریم!

شۆفێرەکە وتی: ئەی بۆچی دەگریت؟

کابرا وتی: ئەمڕۆ خراپترین ڕۆژی ژیانی من بوو!!! شەو درەنگ خەوتم، ئەمەش وایکرد؛ بەیانی درەنگ خەبەرم بێتەوە، بەو درەنگ هەستانەشم لە چاوپێکەوتنێکی زۆر گرنگ دواکەوتم، کە من نەمتوانی گرێبەستێك واژۆ بکەم، بەم هۆیەوە خاوەنی کۆمپانیاکە زۆر تووڕەبوو، لە کارەکەم دەری کردم، ئیدی ڕۆیشتم بۆ لای ئۆتۆمبێلەکەم، کە لە پارکینێکدا ڕام گرتبوو، بینیم ئۆتۆمبێلەکەم لەوێ نییەو دزراوە، زۆر بێتاقەت بووم، بە تەکسی ڕۆیشتمەوە بۆ ماڵەوە، کاتێك دابەزیم، کیفی پارەکەشم لە تەکسییەکەدا لێ بەجێما، چوومە ماڵەوە، بینیم خێزانەکەشم خیانەتم لێ دەکات، هاتم بۆ ئێرە بیرم لە حاڵی خۆم دەکردەوە، کە ئیدی دەبێت کۆتایی بە ژیانی خۆم بهێنم!!! بۆیە ژەهرم کردە ئەو پەرداخە شەربەتەوە، تاوەکو خۆم بکوژم، بەڵام تۆ هاتیو پەرداخە شەربەتەکەت خواردەوە، تەنانەت نەتهێشت کۆتایی بە ژیانی خۆیشم بهێنم!!!

# «بۆ ڕۆژی تەنگانە، کاری ناوازە پاشەکەوت بکە»!

ن: د. عبدالکریم بکار و: ئاسیا صەلاح

کچو کوڕەکانم، ئێمەی مرۆڤ لاوازین، هەرچەندێك بەهێزبین، هەژارین لەلای خودای باڵادەست، هەرچەندێك دەوڵەمەندبین، پێویستە هەمیشە، لە چوارچێوەی ئەو چەمکانەدا هەڵسوکەوت بکەین، حەز دەکەم ئامۆژگارییەکی بەنرخ بە گوێتاندا بچرپێنم، کە بە هیچ نرخێك، ناخەملێنرێت.. ئەویش ئەوەیە: هەریەکەتان، با جەخت بکاتەوە لەسەر بوون بە خاوەنی کارێکی چاکەی تایبەت بە خۆی، لە نێوان خۆیو خودای گەورەدا؛ بە هیوای بەدەستهێنانی پاداشتەکەیو پاشەکەوتکردنی بۆ کاتی کۆسپو تەنگانەکان، هانای پێبەرین بۆ لای خودای باڵادەست، گومانی باشبردن بە خودای گەورە، وامان لێدەکات؛ متمانەمان بە وەڵامدانەوەی هەبێت، ئاشنای بەسەرهاتی ئەو سێ کەسەن، کە پەنایان بۆ ئەشکەوتەکە برد، بەردێك لە شاخەکەوە خلۆر دەبێتەوە، دەرچەی ئەشکەوتەکە دادەخات، زانییان ئەم کارە لە خودای باڵادەستەوەیەو بە هیچ شێوەیەك دەرناچن لێی، تەنها بە یارمەتی خودا نەبێت، هەر بۆیە دەستیان کرد، بە هانابردن بۆ لای خودای گەورە بە باشترینی کارەکانیان، لە ڕاستیشدا چەند کارێکی مەزنو ناوازەبوون، لە ئەنجامدا: خودا بە هانایانەوە هاتو بە سەلامەتی هاتنە دەرەوە، بەسەرهاتی ئەو پیاوەش دەزانن، کە لە بازرگانیدا کاری دەکرد، ئەگەر کەسێکی دیبا، بێپارە بوایەو توانای دانەوەی پارەکەی نەبوایە، بە فەرمانبەرەکانی دەگوت: واز لەو کەسە بهێنن، هیچ شتێکی لێ داوا مەکەن، بە هیوای لێبووردەیی خودا، خوداش لێی خۆشبوو، کەواتە کاری چاکە، هاوشێوەی باڵانسێکی یەدەکە، لە کاتی پێویستیدا لێی ڕادەکێشین، یاخود وەك ستافێکی فریاکەوتنە، لە کاتی تەنگوچەڵەمە گەورەکاندا، پەنای بۆ دەبەین، وا چاکە؛ هەر یەکێك لە ئێمە، لەسەر ئەوە بە هەموو شێوەیەك، پێداگر بێت.

ئازیزانم ئێمەش دەمانەوێت؛ ببین بە پێشەنگی چاکسازیو بانگخوازیی خێر، لەسەر ئاستی ئوممەتو نەتەوەو کۆمەڵگە، هەردەم ببینە سەرچاوەی بەخشندەییو قوربانیدان، بێگومان باشترین شتێك کە پێشکەشی خزمو کەسو نەتەوەکەتانی بکەن، بریتییە لە دەستپێشخەرییە مەزنەکانو ڕەوشتە بەرزەکان، بەڵام نەتەوە، بە چەند بیرۆکەیەکی سادە بەرەو پێش ناچێت، بەڵکو لە ڕێگەی وێنەو نمونەو تواناگەلێکەوە پێش دەکەوێت. ئەو کەسەی نموونەی بەرزی زیاتر پێشکەش دەکات، بێگومان خۆشەویستیشی بۆ نیشتیمانەکەی زیاتر دەکات، ئەمەش چەند نموونەیەك، کە ئەم بیرۆکەیەی سەرەوە ڕوون دەکاتەوە:-

کچێك.. بێوەژنێکی دراوسێیان بەخێو دەکات، کە هیچ کەسێکی نییە، پێداویستییەکانی بۆ دابین بکات، خزمەتی دەکات، لە هەندێك لە کارەکانیدا، یارمەتی دەدات، گرنگی پێ دەدات، لە کاتی پێویستیدا، بڕێك پارەی بۆ دابین دەکات.

چەند گەنجێك ڕۆژانە کاتژمێرێك، یاخود نیو کاتژمێر، پێش خۆرهەڵاتن هەڵدەستن، بۆئەوەی داوای لێخۆشبوون بکەنو نوێژ دەکەن... خانەوادەکانیشیان بەخەبەردێنن بۆ نوێژی بەیانی.

گەنجێك بەخشینێکی کەمی کردووە بە نەریتی ڕۆژانەی، بەڵام بەبەردەوامی.

ئەم کچە بەڵێنێکی بەخۆی داوە، کە بێجگە هەقو ڕاستی لە قسەکانیدا نەبێت، بارودۆخەکە بەهەر شێوەیەك بێت.

ئەم گەنجە، هەموو هاوکۆلێژەکانی، چۆنییەتیی پابەندبوون بە پلانو پارێزگاریکردن لە بەڵێنو پەیمانی لێوەفێر بوون.

ئەم گەنجەیان، نموونەیەکی ناوازە بەجێ دەگەیەنێت لە چاکەکردن، لەگەڵ دایکو باوکو بەزەیی هاتنەوە پێیاندا.

**ئەمە چی دەگەیەنێت لای کچو کوڕەکانم:-**

١- هەرگیز بە دوای پلەو پایەو پارەو ساماندا مەگەڕێن، بەڵکو هەوڵ بدەن سوڕانەوەتان بە دەوری تەوەرەیەکدا بێت، کە بریتی بێت لەو یاساو ڕێسایانەی بڕواتان پێیەتیو ئەو کارە مەزنانەی بە ئەنجامی دەگەیەنن.

٢- سووربن لەسەر شاردنەوەی چاکەکانتان، وەك چۆن لە هەوڵی شاردنەوەی عەیبەکانتان دان.

٣- بەهرەمەندانە، بەدوای ئەو کارە باشەدا بگەڕێن کە دەتوانن ئەنجامی بدەن، تاوەکو کۆمەڵگە، لێوانلێو بێت لە ڕەنگی ئاکارو خوڕەوشتی بەرز.



# مرۆڤدۆستی!

ئارام نەبی مەحموود

خەون بە جیهانێکەوە دەبینم کە: "مرۆڤەکان تێیدا مرۆڤن‌و نرخ‌و بەهای ڕاستەقینەی خۆیان پێدراوەو مرۆڤانە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێت"!

کە منداڵبووم، کاتێك دەمبینی ئافرەتێك، بە کۆڵێك کەلوپەلەوە لە بازاڕ دەگەڕایەوەو شەکەت‌و ماندووە، خێرا بەرەو پیری دەڕۆیشتم‌و باری قورسی سەرشانیم سووك دەکرد، بەوەی هەندێك شتم، لێوەردەگرت‌و تا بەردەرگای ماڵ، لەگەڵیدا دەڕۆیشتم!

ئێستەش نازانم، بۆچی ئەوەندە حەز بەیارمەتیدانی مرۆڤەکان دەکەم؟ بۆ ئەوەندە ڕێزیان دەگرم؟ بۆ ئەوەندە مرۆڤەکانم خۆشدەوێت؟ بۆ نرخ‌و بەهای مرۆڤەکان، لام بە پایان ناگات؟ ئەرێ بۆ ئەوەندە هەستیارم بە وشەی مرۆڤ؟!

بۆ کەسێك نییە، گوێی لە هاوارو سەدای ناخی گڕگرتووم بێت، کە بۆ مرۆڤ دەکوڵێم‌و دەسووتێم؟ بۆ کەسێك نییە لێم تێبگات، کە مرۆڤ ئەو بوونەوەرە گەورەیە، شایەنی ئەوە بووە کڕنووشی ڕێزی بۆ ببرێت؟ کەسێك نییە، ببینێت، کە چۆن دەتوێمەوە، لە پێناو مرۆڤدا! ئامانجمە؛ بتوانم خزمەتی مرۆڤەکان بکەم، یارمەتیان پێشکەش بکەم، بەبێ گوێدانە جیاوازی ڕەنگ، ڕووخسار، شێوە، ئایین، نەژاد!

شەرەفمەندم بەوەی دەستی نابینایەك بگرم، ببمە گۆچانی بەساڵاچوویەك، ڕێگە نیشانی ڕێبوارێك بدەم، کەسێك شتێکی لێبکەوێت، بۆی هەڵبگرمەوە، لەوەی لەگەڵ مرۆڤەکاندا، عەرەبانەی دەستی قورس پاڵ بنێم، پاڵ بە ئوتۆمبێلێکی لە کارکەوتووەوە بنێم! شوێنی دانیشتنەکەم، چۆڵ بکەم بۆ ئافرەتێك، یان بەساڵاچوویەك! یارمەتیدانی نەخۆشێك، کە پێویستی بە فریاکەوتنی خێرایە، دەخەمە پێش هەموو شتێکەوە، تەنانەت نوێژەکەشم!

ئەرکم ئەوەیە؛ ڕێز لە مرۆڤ بگرم، بە گەورەیان بزانم، ببم بە خزمەتکاریان، ئەوەندە مرۆڤم لا مەزنە؛ کاتێك یارمەتیان دەدەم، واهەست دەکەم خەڵاتی ڕێزلێنانم پێبەخشراوە، هەمیشە دەست لەسەر سنگ وەستاوم، تا لە هەلێکدا لێبڕاوانەو بەوپەڕی شانازییەوە، هاوکاریی مرۆڤێك بکەم!

چەندە جوانە، ڕێز لە گەورەکان بگرین، میهرەبان بین بەرامبەر بچووکەکان، بەزەییمان بە پیرەکاندا بێتەوە، چاومان

لە نەخۆشەکان بێت، لە دڵەوە زەردەخەنەی ئومێدیان پێشکەش بکەین، گوێیان لێبگرین‌و داواکارییەکانیان جێبەجێ بکەین!

لە قسەکردن لەگەڵ مرۆڤەکاندا زۆرترین وشە دووبارەبووەکانی سەر زمان ئەمانەن: ببوورە، دەستخۆش، سوپاس، ئەزیەت نەبێت، بە یارمەتیت، .....تاد، دەمەوێت ئەوان وا هەست بکەن، کە گەورەو ڕێزلێگیراون! هاوشێوەی ئەو خزمەتکارە مامەڵە دەکەم، کە خزمەتی پاشاکەی دەکات‌و بە وریاییەوە قسەو گوفتارەکانی هەڵدەبژێرێت، تا دڵی گەورەکەی خۆی، ڕازی بکات!

هەمیشە بەڕێزەوە، مامەڵە لەگەڵ مرۆڤەکان دەکەم، بەوپەڕی ئەدەبەوە، هەڵسوکەوتیان لەتەکدا دەکەم، گەرەکمە جوانترین پەیڤو ناسکترینی وشەو باشترین ڕستە، بخەمە بەر دیدەیان‌و بدەم بە گوێچکەیان، تا نایابترین ئاواز بژنەون، تا گۆرانی بۆ ژیان بڵێن، تا لەگەڵ ژیان ئاشت ببنەوە، تا دەست لە یەخەی ژیان بەردەن، تا واز لە دژایەتیکردن‌و سەرکۆنەکردنی ژیان بهێنن.

فەلسەفەی ژیان چییە.. گرنگ نییە، ئەوەندەش خۆت بەوەوە سەرقاڵ مەکە، تا پێناسەیەك بۆ ژیان بدۆزیتەوە، بەڵکو زانین‌و پراکتیزەکردنی چۆنییەتیی ژیان گرنگە!

ئەی گرۆی ئادەمی.. مرۆڤانە بژین، سادە، لێبوردە، دڵسۆز، بەوەفا، دڵەکانتان مەکەنە خانەو لانەی ڕق‌و کینە، بوغزو حەسادەت لە سینەتاندا بکەنە دەرەوە، نە بەزمان، نە بە دەست، ئازار بە کەس مەگەیەنن، گفتولفتان خۆش بێت، قسەی خۆش‌و زەردەخەنە هیچی تێناچێت، پاك‌و ڕوون‌و بێخەوش بن، پەیوەست بن بە برایەتی‌و هاوڕێیەتی نێوانتانەوە، ڕێز بۆ یەکتر بنوێنن، ئەوپەڕی خۆشەویستی بۆ یەکتر دەرببڕن، تا لە کۆتاییدا ملوانکەی مرۆڤبوون، بخرێتە ملتانەوە!

چەندە جوانە! کۆی مرۆڤایەتی پابەندبن بەو بنەما ڕەوشتییانەی، کە نەك تەنها مرۆڤەکان لەسەری هاوڕاو کۆدەنگن، بەڵکو گشت بوونەوەران‌و گیانداران‌و تەنانەت بێگیانەکانیش لەسەری هاوڕان، ئەمەش بۆ ئەوەی هەمووان پارێزراو بن‌و هیچ کەس، ئازار بەوی تر نەگەیەنێت، بۆ ئەوەی ستەم سەر هەڵنەداو ستەمکار دروووست نەبێت، چون ئەمڕۆ جیهانی مۆدێرنە، ئالوودەی دەردێکی کوشندە بووە، ئەویش ئەوەیە: کە مرۆڤو ئیرادەویستی مرۆڤ، خراوەتە ژێر پۆستاڵی جەلاددەکان‌و کەرامەت‌و شەرەفو خۆێنیان، هەرزانفرۆش کراوە!



# باڵوڵو پزیشكو فەیلەسوف

حەكیم بۆ هەر پرسیارێك وەڵامێكی گورجكبڕی پێبووە، لە مێژووی ژیانیدا، نەبیستراوە هیچ كەس بە وەڵامێك حەكیمی تاساندبێت، بەڵام هەر كەس پرسیارێكی ئاڕاستە كردبێت، بە وەڵامێكی بەپێزو بەهێز تاساندوویەتی، بە جۆرێك، كە بەرامبەری بێدەنگ كردووە، ئەمە جگای ئەوەی ئەگەر بەرامبەرەكەی، پرسیارەكەی بۆ گاڵتەكردنو سەرخستنەسەر حەكیم بووبێت، ئەوا وەڵامێكی وەرگرتوە، كە هەرگیز بە خەیاڵیدا نەیەت، جارێكی دیكە پرسیار ئاڕاستەی حەكیم بكات.

لە چیرۆكی ئەمجارەی حەكیمدا، باس لە وەڵامی حەكیم دەكەین بۆ پزیشكێكی یۆنانیو فەیلەسوفێك كە خەلیفە هاروون، بانگهێشتی كردبوون بۆ شاری بەغداد!

خەلیفە هاروون، بە تایبەتی دەنێرێت بە دوای پزیشكێكی زۆر شارەزاو لێهاتوودا، لە وڵاتی یۆنان.. كاتێك پزیشكەكە دەگاتە بەغدادو دەچێتە ناو كۆشكی خەلیفەوە. خەلیفە هاروون زۆر ڕێزی لێدەگرێتو مەراسیمی تایبەتو شیاوی بۆ سازدەكات.. ڕۆژانە خەڵكی، دەستە دەستە دەچوون بۆ پێشوازیی پزیشكو بەخێرهاتنیان دەكرد.. گەورە پیاوانو كاربەدەستانی شاری بەغداد، بۆ بەخێرهاتنی پزیشكی بەناوبانگ، ڕیزیان بەستبوو، كاتێك حەكیم ناوبانگی ئەم پزیشكەی بیست، حەزی كرد سەردانی بكات، لە ڕۆژی سێهەمدا، حەكیم بە یاوەری چەند كەسێك لە هاوەڵو نزیكانی، ڕۆیشتن بۆ كۆشكی خەلیفە، بۆ دیتنو بەخێرهاتنی پزیشكی بەناوبانگو شارەزای یۆنانی.. لە كاتی خۆناساندنو گفتوگۆدا، لەناكاو حەكیم پرسی: ببورە، جەنابتان ئیشتان چییە؟

پزیشكەكە لەوەو پێش باسی باڵوڵیان بۆ كردبوو، لەبەرئەوە، ویستی كەمێك سەربخاتە سەریو گاڵتەی لەگەڵدا بكات.. داماو، بێخەبەر لە وەڵامە گورجكبڕەكانی حەكیم.. پزیشكەكە وتی: من دكتۆرم، دەتوانم مردوو زیندوو بكەمەوە!!

حەكیم لە وەڵامدا گوتی: تۆ زیندووەكان مەكوژە، مردووە زیندووكردنەوە، پێشكەش بە خۆت بێت!!

بە وەڵامی حەكیم خەلیفە هارونو سەرجەم ئامادەبووان دەستیان كرد بە قاقای پێكەنین.. هەر ئەو ڕۆژە پزیشكەكە ڕۆیشتو بەغدادی جێهێشتو هەرگیز نەگەڕایەوە ئەو شارە.

جارێكی دیكە، فەیلەسوفێك میوانی خەلیفە هارون بوو، حەكیم لەگەڵ دووان لە هاوڕێكانیدا، ڕۆیشتن بۆ كۆشك بۆ دیتنی فەیلەسوف، دوای بەخێرهاتنو یەكترناسین، حەكیم بە میوانەكەی خەلیفە هاروونی گوت: كاری بەڕێزتان چییە؟

فەیلەسوفەكە، كە لە جلوبەرگو شێوەو ڕووخساری حەكیم وردبووەوە، وا هەستیكرد كە ئەم كەسە دێوانەیەو عەقڵی زۆر تەواو نییە.. پێشتریش لەبارەی باڵوڵەوە هەندێك شتی بیستبوو، لەبەرئەوە پێی گوت: من فەیلەسوفم، كاری من ئەوەیە، ئەگەر كەسێك عەقڵی لەسەریدا نەمابێتو فڕی بێت، عەقڵی بۆ بهێنمەوە شوێنی خۆی!

حەكیم گوتی: نا، تۆ بە قسەكانت عەقڵی سەری كەس ناچار بە فڕین مەكە، لەو كەسەش گەڕێ، كە عەقڵی فڕیوەو لە سەریدا نەماوە!



# پێم بڵێ چی دەخۆیت؟ پێت دەڵێم تۆ کێیت؟

## جۆری کەسایەتیت لە ڕێگەی جۆری خواردنەکەتەوە بزانە!

١- ئەگەر حەز بە خواردنی پڕ لە داوودەرمانو بیبەرو خواردنی تیژو سرکەو ئەو جۆرانە دەکەیت.. ئەوە مانای وایە، تۆ کەسێکیت، کە هەوڵ دەدەیت بەسەر شتە نادیارەکاندا سەر بکەویت.

٢- ئەگەر حەز بە خواردنی خێرا دەکەیت، وەکو لەفەو پەتاتەی سورەوەکراوو پەنیرو پاقلەمەنی. ئەوە مانای وایە، تۆ حەز بە کێبەرکێ دەکەیت، سووریت لەسەر بەردەوام بوونت، لە کارکردنو بەدەستهێنانی دەستکەوتو بەرهەمی باش، بێئەوەی کاتەکانت بەفێڕۆ بدەیت.

٣- ئەگەر بە زۆری حەز بە خواردنی سورەوەکراو، یان ڕۆبیان، یاخود گۆشتی برژاوو خواردنەوەی قاوە دەکەیت.. ئەوە مانای وایە، تۆ حەز بە جەربەزەییو بەرەوپێشچوونو خۆشویستنی خود دەکەیت.

٤- ئەگەر حەز بە خواردنی ئاسایی دەکەیت، ئەوە مانای وایە تۆ کەسێکی ئاساییت لە ژیاندا.

٥- ئەگەر زۆر حەز بە خواردنو خۆراك دەکەیت، ئەوە مانای وایە، تۆ کەسێکی ئاڵۆزو وشکیت، حەزوو ئارزووەکانت زاڵن بەسەرتدا.

٦- ئەگەر گرنگی بە خواردنو جۆری خۆراك نادەیت، ئەوە مانای وایە، تۆ کەسێکی لاوازی لە کەسایەتیتدا.

٧- ئەگەر بە دەنگی بەرز خواردن دەجوویت، یان بە دەنگی بەرز بە ددانەکانت خواردنە ڕەقەکان دەشکێنیت، ئەوە مانای وایە، تۆ لەو جۆرە کەسانەی کە دەیەوێت کێبڕکێ لە دەروونی خۆیدا درووست بکات.

٨- ئەگەر تۆ لەو کەسانەیت، کە بەخێرایی نان دەخۆن، مانای وایە تۆ مرۆڤێکی کەمئارامی.. واتە پشوو درێژ نیت.

٩- ئەگەر تۆ لەو کەسانەیت، کە دەورییەکەت پڕدەکەیت لە خواردنو هەموو خواردنەکەش دەخۆیتو هیچی لێ ناهێڵیتەوە، ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی، کە تۆ کەسێکی دەگەڕێیتەوە بۆ سەردەمی منداڵیت، کە ڕێز لە مرۆڤ دەگریت.. بەڵام ئەگەر هەندێك لە خواردنەکەت لە دەورییەکەتدا بەجێ بهێڵیت، ئەوە مانای وایە تۆ جۆرێك لە سەرکێشیت تێدایە.

١٠- ئەگەر تۆ لەو کەسانەیت، کە لە ناوەڕاستی نان، یان کولێرەوە دەخۆیتو قەراغەکانی جێ دەهێڵیت، ئەوە مانای وایە، کە تۆ مرۆڤێکی عەمەلی، دەتەوێت بچیتە ناواخنی بابەتەکەوە، گرنگی بە کردارە ئاساییو ڕواڵەتییەکان نادەیت.

١١- ئەگەر تۆ لەو کەسانەیت، کە جۆرەها خواردن دەکەیت بەسەر یەکداو تێکەڵی دەکەیت، پاشان دەست بە خواردنی دەکەیت، ئەوە مانای وایە، کە تۆ کەسێکی فەرمانەکانی ژیانت تێکەڵاو دەکەیت، هەندێکیان بەسەر هەندێکیاندا دەدەیت، تێڕوانینێکی تێکەڵت هەیە، بۆ سەرجەم کاروبارەکانی ژیان.

١٢- ئەگەر تۆ کەسێکیت، بەشبەش نان دەخۆیت، واتە تۆ کەسێکی بەحەزەریت، زیاتر لە یەك کار لە یەك کاتدا ئەنجام نادەیت.

١٣- ئەگەر تۆ کەسێکیت، حەز بە جۆرەها خواردن دەکەیتو جۆرەها خواردن دەگۆڕیت، ئەوە مانای وایە، تۆ کەسێکی گونجاوو هاوسەنگیت، دەکرێت مامەڵەت لەگەڵدا بکرێت.



# جوانیی سەرنەکەوتن..

و: چیمەن لەتیف

لەسەرنەکەوتن دەترسیت؟ ئایا سامو دڵەکوتەی بەئاکام نەگەیشتن، دای گرتوویت؟ حاشا لەو ساتانەی ڕابردوو دەکەیت، کە تێیدا سەرکەوتوو نەبوویت؟ ئەگەر وەڵامەکەت بەڵێیە، کەواتە: کێشەت هەیە، زۆربەی گومانەکان بۆئەوە دەچن، تۆ ناتوانیت خەونەکانت بەدی بهێنیت.

هاوڕێ، شکست، سەرکەوتنو کرۆکی بەئاکام گەیشتنە! سەرکەوتوویەك لە ژیاندا نابینین، ڕۆژێك لە ڕۆژان نەگلا بێت، بەرەنگاری هەرکەسێك دەبمەوە، کە جورئەت بەسەر یاساکانی گەردووندا بکات، وا بزانێت سەرکەوتن، هەمیشە یاوەری ئادەمیزادە. سەرنەکەوتن پوختەی تاقیکردنەوەکانمانە، چاکسازیو ڕاستکردنەوەی هەڵدێرەکانی ژیانە، پلەیەکە بۆ گەیشتن، بە کۆشکی سەرکەوتن.

سەرەك وەزیرانی پێشووی شانشینی یەکگرتوو (وینستۆن چەرچڵ)، پێناسەیەکی جوانیی سەرکەوتن دەکاتو دەڵێت: سەرکەوتن بریتییە لە توانای گوێزانەوە، لە شکستێکەوە بۆ شکستێکی دیکە، بێئەوەی ئیرادە لەدەست بدەیت. وەك ئەوەی بەئاکام نەگەیشتن، بنەمایەك بێت لەبنەماکانی شکست، بەبێ شکست، سەرکەوتن مەحاڵە، دوور لە گلان، چێژی سەرکەوتن مەحاڵە.

ئەم دەستەواژەیە، واتای ئەوەیە؛ ئایا ئێمە بەشکست ڕازیبین؛ بێدەنگ بین بەرامبەری؟! بێگومان نا، ئەوە لغاوکردنی ئاواتەکانمانە، ئێمە زیاترمان لە تۆ گەرەکە، ئەوەی لە تۆ دەمانەوێت بایەخدانە بەشتێکی زۆر گرنگ، ئەوەش ئەوەیە: شکست بەشێکە لە دەستکەوتەکان، چونکە دەتەوێت کارێك ئەنجام بدەیت، دڵەکوتێ نزیکە لەو کەسەی، دەیەوێت ئاوازی گۆڕانکاری بچڕێت.

زۆر بەسادەیی، چەندێك لەژیاندا کارابیت، کاروکۆششت زۆربێت، چەندێك بزۆز بیت، هێندەش دەگلێیت، بەپێچەوانەوە، ئەوانەی لە گۆشەی تەنیاییدا دانیشتوونو ئەژنۆکانیان توند لەباوەش گرتووە، خزمەتگوزارییەکی باشی خۆیانو کۆمەڵگاکەیان نین.

وەڵامی گونجاو بۆ شکست، بریتییە لە: سەرکەوتنێکی یەکلاکەرەوە، مامەڵەی نموونەیی لەگەڵ شکستدا، بریتییە لە: دووبارەکردنەوەی ئەزموونەکان، لێکۆڵینەوە لە هۆکارەکانی بەئاکام نەگەیشتنو سەرکەوتن بەسەریدا. بەداخەوە، لە ژیاندا، کەسانێکی زۆر شکست کۆڵی پێداون، کەسانێك هەن نزیك دەبنەوە لە سەرکەوتن، لەو کاتەدا بەهۆی شکستێکەوە لە کارێکدا کۆڵ دەدەنو پاڵ دەدەنەوە، دواتر خۆبەدەست شکستەوە دەدەن.

بەڵێ زۆرن ئەوانەی دەوەستن بۆئەوەی تاڵاوی شکست نەچێژن، بەڵام هەست ناکەن ئەوان چەند نزیکبوونەوە لەشکست ئەگەر "بەچەکی ورەو خۆڕاگری خۆیان، تەیار نەکردابا"!

ئاینی ئیسلام، لە کاروکۆششدا، بەرنامەیەکی پتەوی داڕشتووە، بەربەستە دەروونییەکان لادەبات، کە ئاستەنگن لە بەردەم تاقیکردنەوەو دەرکەوتنی ورەی کەسی تێکۆشەردا، شوێنکەوتووانی، هاندەدات بۆچوونو کۆششەکانیان تاقی بکەنەوە، ئەو کارانەی تەواوی دەکەن، هۆکار بگرنەبەرو بەرەنگار ببنەوە، ئەوکات، تەنانەت هەڵەکانیشیان، لەبەرچاو دەگیرێت.

**کاتێك سەرکەوتوو نابین، پێویستە چی بکەین؟**

ئەم خاڵانە، یارمەتیدەرن بۆ تێپەڕاندنی ئەو تاقیکردنەوەیە، شکستخواردووانە، کە پێیدا تێدەپەڕیت:

١- دڵنیابە بەئاکام نەگەیشتن، ئەوە ناگەیەنێت، کە تۆ کەسێکی

سەرنەکەوتوویت. سروشتییە کاتێك سەر ناکەویت، خەمبار بیت، ئازار بچێژیت، کاتێك بەئاکامی دڵی خۆت ناگەیت، بەڵام گرنگ ئەوەیە، نەهێڵیت هەستە خراپەکان بەسەرتدا زاڵبنو دەست لە بینت بنێن. ئەوەی گرنگە، جیاکارییە لە نێوان لێپێچینەوەی دەروون؛ بەمەبەستی فێربوونو زیاد سەرکۆنەو باسکردنێتی؛ بە نەزانو هەستپێنەکەر.

٢- دڵنیابە؛ شکست ئەوە ناگەیەنێت، کە تۆ ناتوانیت، ئەو کارەی مەبەستە، تەواوی بکەیت.

سەرنەکەوتنت لە ژیانی هاوسەریتدا، ئەوە ناگەیەنێت، کە تۆ، مێردێکی خراپی، یان لە داهاتوودا، بە ئاکامی دڵ ناگەیت، سەرنەکەوتن لە کارێکدا، ئاماژە نییە، بۆئەوەی تۆ شایانی ئەو کارە نیت، دەبێت بەشوێن کاری تردا وێڵبیت.

نەخێر... سەرنەکەوتن لە تاقیکردنەوەیەکدا، وات لێدەکات، لە دووبارەکردنەوەی هەمان تاقیکردنەوەدا، زیاتر هۆشیار بیت، کەمتر هەڵەبکەیت، بەمەرجێك، لە تاقیکردنەوەکانی ڕابوردوودا، شارەزاییت پەیدا کردبێت.

٣- جیاکاربە؛ لە نێوان شکست لە هەڵبژاردنی ئامانجو دیاریکردنی ڕێگادا.. چونکە زۆربەمان، کاتێك لە گەیشتن بەئامانجێکدا شکست دەهێنین، لە مەبەستەکە، دەکەوینە گومانەوە، لە کاتێکدا گرفتەکە، تەنها لە هەڵبژاردنی ڕێگا "چۆنێتیی تەواوکردنی کارەکە"دایە، ئەم تێکەڵاوکردنە، مەترسیدارترین کارە، کاتێك ڕووبەڕوومان دەبێتەوە! چونکە بەشێکی زۆری تەمەنمان، لە نێوان دیاریکردنی ئامانجێکو دوورکەوتنەوە لە مەبەستێکی تر، بەفیڕۆ دەدات، وامان لێدەکات؛ بیرو هزرمان پەرت بێت، لە نێوان ئەوەی دەمانەوێت، پەشۆکاوبین، نەزانین چیمان دەوێت، لە کاتێکدا تەنها ئەوەی دەمانەوێت، ڕێگایەکی ترە، بەگەیشتن بەوەی گەرەکمانە.

٤- دڵنیابە؛ شکست تەمەنت بەفیڕۆ نادات. ئاخ مەکێشە بۆ کارێك، لە ڕۆژانی ڕابوردوودا، تەواوت کردووەو تێیدا سەرکەوتوو نەبوویت، باوەڕ بکە، ئەو زانیارییانەی، لە چەمەدان، "سندوق"ی زانیارییەکاندا، کەڵەکەت کردوون، نرخیان ناخەمڵێندرێت، ژیان چییە؟ کۆمەڵێك تاقیکردنەوەیە.. پەیامبەر (درودی خودای لێبێت) هەمیشە هانمان دەدات، بەوەی (بەهاو درووستیی کارەکان، پەندوەرگرتن لێیان، لە کۆتاییدا دەردەکەوێت).

٥- شکست واتای شکست نییە! بەلاتەوە سەیر نەبێت، شکست ئەوە ناگەیەنێت، کە تۆ بڕوانامەی سەرنەکەوتن وەربگریت، یان دنیا پەنجەی تۆمەتباریت، ئاڕاستە بکات، یاخود بەچاوی گومانو دڕدۆنگییەوە، تەماشات بکەن. هەروەها ئەوە ناگەیەنێت، کە تۆ پۆشاکی زەلیلی بپۆشیت، ئەوەی ماوە لە تەمەنت، لە ڕیزی تەوەزەلانو شکستخواردواندا بێیتە ئەژمار، نەخێر.

ئەوە تاقیکردنەوەیەکە، کۆتایی کایەکە نییە، ڕووداوێکە، جەنگ نییە... قۆناغێکە، کۆتایی یارییەکە نییە. باوەڕبکە... خۆری سەرکەوتن نادرەوشێتەوە، ئەگەر تاریکیو شکست، پێشی نەکەون.

پوختە: فێربە چێژ لەشکست وەرگرە، ڕابمێنە لە شکستەکانت، تا لە نێوان تاریکی سەرنەکەوتنەکانتدا، پنتی ڕووناکی بدۆزیتەوە، دواتر دەرگای هەموو ژیانتی، پێ ڕووناك بکەرەوە.

# ژیانی منداڵیت!

و: حسین محمود هەڵەبجەیی



باسی ژیانی منداڵی خۆتت بۆ دەکەم، تا متمانەت بە خۆت بۆ بگەڕێتەوە، لە ساتی لەدایکبوونتداو دوای ئەوەی کە هەوای ژیانت هەڵمژی، هەرکەس ڕەت ببوایە بەلاتا هەردوو دەستت بۆ بەرز دەکردەوە، ئایا نازانیت مانای ئەوەیە کە تۆ بەرزیو بڵندیت دەوێت، دەتەویست هەڵسیتەوەو بڕۆیت بەڕێوەو لەسەر پێکانت بووەستیت، تا بە دڵی خۆت چێژ لە بینینی ژیان وەربگریت، پاشان بە لای ڕاستو چەپدا شتی تازەت دەبینیو دەدۆزییەوەو تەماشای ئاسمانت دەکرد، تۆ متمانەت بە خۆت هەبوو، ئاواتەخواز بوویت کارە سەربەستەکانت ئەنجام بدەیت، ئەو پرسیارەی ئێستا دێت بە بیرتدا ئەوەیە کە: کێ بووە هۆی ئەوەی متمانەت بە خۆت نەمێنێت؟ کێ متمانەی تۆی بە تەواوی داڕوخاند؟ ئەوانە مرۆڤەکان بوون، متمانەیان لە تۆ داڕنیو بەبێ ئەنقەست، بەڵکو لۆمەو پلاری خەڵکی هەرگیز کۆتایی نایەت، ئەگەر هەستیتەوە پێت دەڵێن: ئەوە هەر بە پێوە دەمێنیتەوە؟! ئەگەر دانیشیت ئەوە پێت دەڵێن: ئەوە هەر بە دانیشتوویی دەمێنیتەوە؟! تەنانەت ئەگەر پیادە ڕۆیشتن بکەیت دەڵێن: ئەوە هەر بەردەوام پیادە ڕۆیشتن دەکەیت؟!

من زۆر حەزم لە پیادە ڕۆیشتن بوو، بەیانیان زوو خۆم گورج دەکردەوەو لە شوێنێکەوە دەڕۆشتم بۆ شوێنێکی دیکە، هەندێ کەس گاڵتەیان پێ دەکردم، چونکە من پیادە ڕۆیشتنی زۆرم دەکرد، کاتێك وتم لە ماڵەوە دادەنیشم، نارۆمە دەرەوە تەنها بۆ نوێژکردن نەبێت، یان بۆ پێویستییەك، پاش ماوەیەك دەگەشتم بە هەندێك کەس پێیان دەوتم: ئەوە بۆ خۆت بەند کردووە لە ماڵەوەو نایەیتە دەرەوە؟! لەو ساتەوە دەرکم بەوە کرد مرۆڤەکان هۆکاری داڕوخانی ئێمەن، وەك چۆن ئێمەش هۆکاری داڕوخانی کەسانی ترین، هەرگیز ناتوانین هەموو کەس لە خۆمان ڕازیی بکەین، لەبەرئەوە متمانەت بە خۆت هەبێتو گرنگی بە بۆچوونە نادروستەکانیان مەدە.



# بنەمای جیاکاری

چیا عەبدوڵا
بەشی سێیەم

**بۆئەوەی بەرامبەر شتەکان، ڕوانینێکی درووستت هەبێت، دەبێت خۆت، لەم پێنج خاڵە نەرێنییە، بپارێزیت.**

**٢- بەراوردکردن:-**

بەراوردکردن، ئێمە مەیلمان بەلای ئەوەدا دەچێت، کە بەراورد بکەین، لە نێوان خۆمانو بەرامبەردا، زۆر بەداخەوە، لەم کرداری بەراوردکردنەدا، تەنها ئێمە دۆڕاوین، چونکە بەراوردکردن، وەستاوە لەسەر ئەو شتانەی، کە ئێمە نیمانەو بەرامبەر هەیەتی، بۆ نموونە: گەر ئۆتۆمبێلێکی بچووکم هەبێت، سەیری کەسێک دەکەم، کە ئۆتۆمبێلێکی گەورەی هەیە، وەك لەم حاڵەتەدا، هەست بەتەنگەتاوی دەکەم، چونکە ئۆتۆمبێلێکی وەك ئەوم نییە.

کرداری بەراوردکردن، لە بەرژەوەندیی ئێمە نییە، چونکە ئەم کردارە، وەستاوە لەسەر ئەوەی، کە لای ئێمە نییەو بەرامبەر هەیەتی، یان تێیدا باشە، بێگومان ئەم بەراوردکردنە، دەدۆڕێنینو هەست بەدڵتەنگی دەکەین، خۆ ئەگەر هەر دەبێت، بەراوردکردن ببێت، ئەنجامی بدە، بەڵام ئەو بەراوردکردنەی ئێستا، لە ئایندەدا دەبێت، بە چیو چۆن دەگۆڕێت؟ لەخۆت بپرسە؛ من چۆن دەتوانم ژیانم باشتر بکەم لەمڕۆدا؟ لەبری بەراوردکردن، تەرکیز بخەرە سەر توانا کەسییەکانتو گەشەیان پێبدە، لە یادت بێت؛ هەر یەکێك لە ئێمە، بەلایەنی کەمەوە، لە یەك شتدا جیاوازە، لە هەموو ئەوانی تر، واز لە بەراوردکردن بهێنەو ئێستا دەست بکە، بە باشترکردنی ژیانت.

**٣- ژیان لە ڕابوردوودا:-** ژیان لەڕابوردوودا، گەر تۆ لەو کەسانەیت، کە لەڕابوردوودا دەژیت، ئەوا دڵنیابە، کە ژیانی ئێستاو ئایندەشت، هەر ئەوە دەبێت، ژیان لە ڕابوردوودا، بنەمایەکی سەرەکیی دۆڕانە، چونکە ڕابوردوو، تەواو بۆ هەتاهەتایی ڕۆیشت، بەڵام دەکرێت لە ڕابوردووەوە فێرببینو ئەو زانیارییانەی کە لە ڕابوردوودا فێری بووین، بەکاری بهێنین بۆ باشترکردنی ژیانی ئێستامان.

(د. جۆن گریندەر)، کە یەکێك لە دامەزرێنەرانی (NLP)، دەڵێت: (هەرگیز ڕابوردوو، یەکسان نییە بە ئایندە، ئەمەش ڕاستەقینەیە، گرنگ نییە لە ڕابوردوو، یان دوێنێ، یان بگرە خولەکی پێش ئێستاش، چی ڕوویداوە، گرنگ ئەوەیە، ئێستا چی ڕوو دەدات، تۆ تواناو هێزت هەیە، کە ڕابوردوو، ئازاد بکەیتو لە ئێستادا بژیت، بە هەموو ماناکانییەوە).

**٤-ڕەخنەگرتن:-**

ڕەخنەگرتن، لە یادم ناچێت؛ کاتێك کە بەڕێوەبەری ئابووریی میوانخانە بووم، دەبوو ساڵانە ئامادەی کۆبوونەوە بم، لەبەرئەوە، بەردەوام نائارام بووم، چونکە هەموو ئەو کارانەی، کە بەڕێوەبەری کارەکەم، ئەنجامی دەدا، تەنها لۆمەو ڕەخنە بوو؛ لەسەر هەموو شتێکو هەموو کەسێك، ئیتر ئەم کۆبوونەوانە، بووبوونە دێوەزمە لای منو ئامادەبووانیش.

پێش ئەوەی ڕەخنە لە کەسێك بگریت، چرکەیەك بوەستەو ئەوە بیری خۆت بهێنەرەوە، کە تۆو کەسی بەرامبەر، بە هۆی ئەم ڕەخنەیەوە، هەستو شعوری نەرێنی، دەکەوێتە نێوانتانەوە.

ڕەخنەگرتن هۆکاری سەرەکیی دۆڕانە، پێش ئەوەی ڕەخنە لە کەسێك بگریت، هەناسەیەکی قوڵ هەڵبمژەو بەپێچەوانەوە لە (١٠)وە بۆ (١) بژمێرەو هەر نائارامییەك، لە دەروونتدایە، ئازادی بکەو فڕێی بدەو بیر لە (٣) تایبەتمەندی بکەرەوە، کە لەو کەسەدایەو تەرکیزو ئاگاییت بخەرە سەر خاڵی هێزی، لەبری خاڵە لاوازەکانیو بەنەرمی، مامەڵەی لەگەڵدا بکە، هاوڕێیەکم خاوەنی کۆمپانیایەکە، تایبەت بە بەرنامەی کۆمپیوتەری، جارێك پێی وتم: کە بیردۆزی سێ لە یەکدا، بەکاردەهێنیت، وتم: بیردۆزی سێ لە یەکدا چییە؟ وتی: هەموو جارێك، ڕەخنە لە کەسێك دەگریت، (٣) جار مەدحی بکە، (هۆراسیش) دەڵێت:- (ئەو کەسەی بە نەرمی، مامەڵە لەگەڵ دەوروبەردا دەکات، زۆر پێش دەکەوێت).

**٥- دیاردەی من منە:-**

دیاردەی من منە، کۆمپانیای هێلی تەلەفۆنات، لە نیویۆرك، لێکۆڵینەوەیەکی ئەنجامدا، لەسەرئەوەی بزانن زۆرترین وشە، کە خەڵك بەکاری دەهێنێت، لە کاتی وتووێژدا چییە؟ دەزانن چی بوو؟ لە (٥٠٠٠) پەیوەندیی تەلەفۆنیدا، (٣٩٩٠)یان، چەند جارێکی زۆر، وشەی (من)، من وەك کەسێك، من وەك خۆم بەکارهاتووە.. هونەرمەندو ئەکتەری کۆمیدی (کارول بۆرینت)، جارێك لەگەڵ کەسێکدا دەدوا، بۆ ماوەی (٢٠) خولەك، تەنها باسی خۆی کرد، پاشان وەستاو سەیری کاتژمێرەکەی دەستی کردو وتی: زۆر داوای لێبوردن دەکەم، ماوەیەکی زۆرە، تەنیا لەبارەی خۆم دەدوێم، ئێستا فەرموو قسە بکە، ئایا بۆچوونت لەبارەی (من) چۆنە؟ گەر دەتەوێت، خەڵك گاڵتەت پێ بکات، یان خۆیت لێ بەدوور بگرێت، ئەوا تەنها باسی خۆت بکە!! بەردەوام لە یادت بێت، کە هەموو کەسێك، دەنگێکی ناوەکی هەیە دەڵێت: من گرنگترین مرۆڤم لە جیهاندا لای خۆم، پەندێکی دێرین هەیە دەڵێت:- (باسی خۆت بکە بۆ خەڵك، گوێت لێدەگرن، سەبارەت بە بەرامبەرەکەت بدوێ، تۆی خۆشدەوێت). وشەی (من)، لە قسەکانتدا، کەم بکەرەوەو سەخی بە لەبەکارهێنانی وشەی (تۆ)دا.



# چیتر نامترسێنێ!

رابەر ئەحمەد وەرتی

چیتر ستەم نامترسێنێ، بەهێزترم دەکات!
چیتر ترس نامترسێنێ، لوتکەم پیشان دەدات!
چیتر نەخۆشی نامترسێنێ، سزای تاوانەکانم بیر دێنێتەوە!
چیتر شکست نامترسێنێ، ئەزموونی زیاترم پێ دەبەخشێ!
چیتر سەرکەوتنی خەڵکی، نامترسێنێ، سوورترم دەکات!
چیتر بەڵاو نارەحەتی نامترسێنێ، شوکرانەبژێریم خەڵات دەکات!
چیتر دڵی پڕ لە ئازار، نامترسێنێ، میهرو سۆزم پێشکەش دەکات!
چیتر هەوری ڕەش نامترسێنێ، ئومێدەواری خۆرم دەکات!
چیتر فرمێسکباران نامترسێنێ، پەلکەزێڕینەم بۆ درووست دەکات!
چیتر تاقیکردنەوە نامترسێنێ، فێرم دەکات!
چیتر ڕقوقین نامترسێنێ، خۆشەویستیم پێ دەبەخشێت!
چیتر گۆڕستان نامترسێنێ، مردنم بیردەخاتەوە!
چیتر دواکەوتن نامترسێنێ، گرنگیی کاتم بۆ دەردەخات!
چیتر سەرگەردانی نامترسێنێ، تیشکی خۆدۆزینەوەم ئاڕاستە دەکات!
چیتر چاوەڕوانی نامترسێنێ، هیوام پێ دەدات!
چیتر خۆشی دەوروبەرم نامترسێنێ، دڵودەروونم دەکاتەوە!
چیتر چوونە ناو خەڵك نامترسێنێ، واقیعی کۆمەڵگەم تێدەگەیەنێ!
چیتر تووڕەیی نامترسێنێ، نرخی نەرمونیانیم دەداتێ!
چیتر تۆڵەکردنەوە نامترسێنێ، چاوپۆشینم پتر دەکات!
چیتر قسەی زۆر نامترسێنێ، نهێنی گوێگرتنم بۆ ئاشکرا دەکات!
چیتر شاخ نامترسێنێ، هێزو توانام زیاد دەکات!
چیتر بەڵێن نامترسێنێ، دڵی خاوەنەکەیم بۆ دەردەخات!
چیتر سەرقاڵی زۆر نامترسێنێ، گرنگی پێدانم بۆ دەردەخات!
چیتر دووری نامترسێنێ، عیشقم زیاد دەکات!
چیتر هەواڵ نەپرسین نامترسێنێ، سیلەی ڕەحمم پێ ئەدا دەکات!
چیتر کێشەو گرفت نامترسێنێ، گەڕان بە دوای چارەسەرم تێدا دەڕوێنێ!
چیتر سەرزەنشتکردن نامترسێنێ، بزەم بۆ درووست دەکات!

## ئەو منداڵە بێ باوكانەی ڕێڕەوی مێژوویان گۆڕی!



بەرزان ئەبوبەكر

# گێرهارد شرۆدەر ١٩٤٤ - ......

سەرەتای ژیانی: شرۆدەر كوڕی خێزانێكی هەژاربوو، كە لە پێنج ئەندام پێكهاتبوون، لە «٧ نیسانی ساڵی ١٩٤٤» لە شارۆچكەی موزنبێرگ –فوهرین لە نزیك شاری لیب لە ویلایەتی نوردراین –فیستفالن، لە كاتێكدا تەنها سێ ڕۆژ بوو، باوكی لە جەنگی جیهانی دووەمدا، لە ڕۆمانیا كوژرابوو.. لەدایكبوو.

خوێندنی پیشەیی، لە ساڵی ١٩٦١ تەواوكردووە، شرۆدەر لە ناوچەكەی خۆیدا، یاریزانی تۆپی پێی میللی بووە، بە هۆی لێهاتوویی لە یاریدا، هاوڕێكانی نازناوی حەفارەیان لێناوە.. ئەوەش لەبەرئەوەی كە هەرگیز بێهیوایی‌و نائومێدی نەدەزانی، هەرچەندە دووچاری بارودۆخی ناڕەحەت‌و ناهەمواریش ببوایەتەوە.

لە نێوان ساڵانی «١٩٦٤ بۆ ١٩٦٨»، خوێندنی ئامادەیی لە ئەڵمانیا تەواوكردووە.. شرۆدەر لە زانكۆی گۆتنگن لە بەشی یاسا، بۆ پارێزەری خوێندوویەتی، لە ساڵی ١٩٧١ بۆ ١٩٧٦ سەرجەمی تاقیكردنەوەكانی تەواوكردووە، شرۆدەر لە ساڵی ١٩٧٦ بۆ ١٩٩٠، سەرقاڵی كاری پارێزەری بووە.

دوای ئەوەی پارتەكەی شرۆدەر، لە ساڵی ١٩٩٠، توانی لە هەڵبژاردنەكاندا، سەركەوتن بەدەست بهێنێت، شرۆدەر بووەتە سەرۆكی ویلایەتی ساكسونیای خواروو، هەروەها بۆ جاری دووەم، لە هەڵبژاردنەكانی ساڵی ١٩٩٤ پارتەكەی سەركەوتنی بەدەستهێنا، بەڵام ئەمجارەیان بە زۆرینەیەكی ڕەها. بەڵام بە پلەی یەكەم نا!

پارتەكەی، لە ساڵی «١٩٩٨»دا، بۆ سەرۆكایەتیی بانگەشەی هەڵبژاردن، دەستنیشانیان كرد.

### ڕاوێژكاری ئەڵمانیا ساڵی (١٩٩٨ - ٢٠٠٢):-

شرۆدەر دانی بەوەدا نا، كە لە هەشتاكاندا لەبەردەم تەلاری ڕاوێژكاری لە (بون هز) ڕاوەستاوەو بە هەموو توانای هاواری كردووەو وتوویەتی: ڕۆژێك دەبێت ببمە سەرۆك‌و ڕاوێژكاری ئەڵمانیا.. ئەم ئاواتەی شرۆدەر نەچووە ژێر خاك، بەڵكو لە ساڵی ١٩٩٨دا، پارتەكەی لە هەڵبژاردنی وڵاتەكەیدا سەركەوتوو بوو، دوای شانزە ساڵ لە فەرمانڕەوایی پارتی مەسیحیی دیموكراسی بە سەرۆكایەتی (هیلمۆت كۆل)، توانییان كورسی دەسەڵاتیان لە ڕێگەی هەڵبژاردنەوە لێوەربگرن.

شرۆدەر، بوو بە سەرۆكی ئەڵمانیا، هەرچەندە پارتەكەی نەیتوانی دەنگی پێویست بەدەست بهێنێت، بۆ پێكهێنانی حكومەت، لەبەرئەوە لەگەڵ پارتی سەوزی وڵاتەكەیدا، ڕێكەوتنیان كردو پێكەوە حكومەتیان پێكهێنا بە سەرۆكایەتی شرۆدەر.. ئەو منداڵەی دوێنێ، كە بە بێباوكی گەورە بوو، تەنانەت باوكی بە چاوی خۆی نەدیتبوو.. ئەمڕۆ ئاواتەكەی منداڵی هاتۆتە دی‌و بووەتە سەرۆكی وڵاتی ئەڵمانیا..

یەكەم سەرەكیترین كاری حكومەتەكەی شرۆدەر، ڕووبەڕووبوونەوەی ڕێژەی بەرزی بێكاری‌و بێبازاڕی‌و سستی بازرگانی بوو، هەروەها بنیاتنانەوەو بوژانەوەی ئابوریی ئەڵمانیای ڕۆژهەڵاتی بوو.

### ڕاوێژكاری ئەڵمانیا ساڵی ٢٠٠٢ بۆ ٢٠٠٥:-

دوای سەركەوتنی پارتە ڕكابەرەكەی شرۆدەر، لە ١١ ویلایەتدا، لە كۆی شانزە ویلایەت.. شكستهێنانی پارتی دیموكراتیی كۆمەڵایەتی، بە سەرۆكایەتی شرۆدەر لە هەڵبژاردنە سەرەتاییەكاندا، لە ساڵی ٢٠٠٥ ویلایەتی (نوردراین) كە گەورەترین ویلایەتی ئەڵمانیا بوو، لە ڕووی دانیشتوانەوە، شرۆدەر بە شێوەیەكی كتوپڕو لەناكاو بڕیاری دا، بەپەلە هەڵبژاردن بۆ سەرۆكایەتی فەرمی ئەڵمانیا

ئەنجام بدرێت، ساڵێك پێش وادەی دیاریكراوی خۆی.

شرۆدەر هۆكاری ئەو هەنگاوەی بۆ ئەوە گەڕاندەوە، كە دەیەوێت دڵنیابێت لە متمانەی گەلی ئەڵمانیا، هەروەها لە چوارچێوەی سیاسەتی چاكسازی وڵاتەكەیدا، ئەو وتی: ئەگەر گەلەكەی متمانەیان بە شرۆدەرو پارتەكەی نەمابێتو دەنگی پێنەدەن، ئەوا ئەو شایستەی ئەو پۆستە نییەو بەزۆر لە پۆستەكەیدا نامێنێتەوە.. (بەڕێزان بە وردی سەرنجی ئەم هەڵوێستە سەرسوڕهێنەرە بدەن.. كاتێك شرۆدەرو پارتەكەی لە هەڵبژاردنە سەرەتاییەكاندا، شكست دەهێنن، ئەو كاتەی پارتە ڕكابەرەكەی، لە كۆی ١٦ ویلایەت، لە ١١ ویلایەتدا، سەركەوتن بەدەستدەهێنێت.. لەبری ئەوەی بۆ هەڵبژاردنی سەرۆكایەتی، كە هێشتا ساڵێكی ماوە، بیر لە تەزویراتو فروفێڵو بەهەدەردانی سامانی وڵاتەكەی بكاتەوە، بیر لە كڕینی دەنگی هاوڵاتیی وڵاتەكەی بكاتەوە، بە پێچەوانەوە، وادەی هەڵبژاردن، بە بڕیارێكی سەرۆكایەتی، بۆ ماوەی ساڵێك پێش دەخاتو دەڵێت: ئەگەر هاوڵاتیانی وڵاتەكەم، متمانەیان بە من نەماوە، ئەوا من شایستەی ئەم پۆستە نیم، لەبەرئەوە دەبێت هەڵبژاردن ئەنجام بدرێتو كەسێك ئەم پۆستە وەربگرێت، كە شایستەیەو هاوڵاتیان متمانەی پێدەبەخشن.. پرسیار لێرەدا ئەوەیە، ئاخۆ كەی بێت، ئاستی ڕۆشنبیریی وڵاتی لەمەڕ خۆمان، بگاتە ئەو ئاستەو هەر كات هاوڵاتیان، لە ڕێگەی سندووقەكانی دەنگدانەوە، متمانەیان لەسەرۆكەكان وەرگرتەوە، بە ویستی خۆیان، كورسیی دەسەڵاتەكەیان، پێشكەش بەو كەسە بكەن، كە متمانەی هاوڵاتیانی بەدەستهێناوە؟؟!!! بەداخەوە لەم هەرێمەو لە وڵاتانی جیهانی سێیەمدا، هەركەس پۆستێكی وەرگرت، تا ئەو ساتەی لە ژیاندایە، هیچ كەس بە شیاوی ئەو پۆستە نازانێت، جگە لە خۆی!!).

حكومەتەكەی شرۆدەر، پشتگیری لە تواناو گەشەپێدانی یەكێتیی ئەوروپا كرد، هەروەها شرۆدەر لە سەردەمی دەسەڵاتەكەیدا، كە جەنگی ئەمریكا عێراق ڕووی دا، شرۆدەر دژی بەشداریكردنی سەربازی بوو، بۆ سەر عێراق، بەڵكو زۆر پشتگیری چارەسەری ئاشتییانەی دەكردو پێی وابوو، دەبێت لە ڕێی مێزی گفتوگۆو لەیەك تێگەیشتنەوە، چارەسەری كێشەكانی عێراق بكرێت..

ئەم دژایەتییە توندەشی بۆ شەڕی عێراق، زیانی گەورەی بە پەیوەندییەكانی نێوان ئەڵمانیاو واشنتون گەیاند، كە ماوەیەكی زۆر بوو، هاوپەیمانی نزیكی ئەمریكا بوو.. بەڵام ئەم بڕیارەی شرۆدەر، لە دژی بەشداریكردنی وڵاتەكەی لە جەنگی عێراقدا، بووە هۆی ئەوەی جەماوەرێكی گەورەی بەدەست هێنا، بووە پاڵەوانێك لەبەرچاوی هاوڵاتیانی وڵاتەكەی، چونكە وڵاتەكەی لە جەنگ پاراستووە، بەتایبەت لە چاوی ئەوانەدا، كە بەشداری جەنگی جیهانیی دووەمیان كردبوو.

سەبارەت بەم بابەتە، نووسەری بەناوبانگ (ئەندریسان بیتسولد) سەرنووسەری گۆڤاری شتیرن، ئەو بۆچوونەی، كە شرۆدەر كردی، بەرامبەر ئەمریكا، بووە هۆی زیندوو هێشتنەوەی شرۆدەر، لە سیاسەتی دەرەوەدا.. هەروەها بووە هۆی زیانگەیاندن، بە دەسەڵاتی ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا، چونكە وڵاتێكی گەورەی وەكو ئەڵمانیا، درووشمی (نا بۆ جەنگ دژی عێراق)ی بەرزكردەوە!

**هەڵبژاردنەكانی ١٨ ئەیلولی ساڵی ٢٠٠٥:-**

پارتەكەی شرۆدەر، پلەی دووەمی بە ڕێژەی ٣٤،٢٪ لە هەڵبژاردنەكەی ئەیلولی ٢٠٠٥دا بەدەست هێنا، بەمەش كەوتە دوای پارتی ڕكابەرەكەیەوە (پارتی دیموكراتی مەسیحییەكان) بە سەرۆكایەتی (ئەنگێلا مێركل)، كە ئەوان توانییان ڕێژەی ٣٥،١٪ بۆخۆیان مسۆگەر بكەن.

ئەم ئەنجامەش سوپرایزێك بوو، بە نیسبەت ئەو پێشهاتو چاوەڕوانییەی كە پارتەكەی شرۆدەر كردبووی، چونكە ئەوان بە پێی هەڵبژاردنە سەرەتاییەكان، پێیان وابوو لە هەڵبژاردندا، دووچاری شكستێكی گەورە دەبن..

لە یەكەم كاردانەوەیدا، شرۆدەر پاش ڕاگەیاندنی ئەنجامەكانی هەڵبژاردنەكە، وتی: ئەڵمانیا نوێنەرێكی نوێی هەڵبژاردووە، هەرچەندە ئەوان لە مێركل ڕازی نین، كە ببێتە ڕاوێژكاری ئەڵمانیا.

**دابڕانی شرۆدەر:**

دوای گفتوگۆو ڕاگۆڕینەوەیەكی سەختو دژوار، لەگەڵ پارتی ڕكابەردا، بە سەرۆكایەتیی ئەنگێلا مێركل، هەردوو پارتەكە، بڕیاریان دا: پێكەوە حكومەتێك پێكبهێنن، بە سەرۆكایەتی مێركل.

مێركل، بووە یەكەم ئافرەتی ڕاوێژكار لە ئەڵمانیا، لە «٢٢ تشرینی دووەمی ساڵی ٢٠٠٥»دا.

دوای ئەوە ڕێكەوتننامەیە، شرۆدەر بڕیاری دا، لە كاری سیاسی دوور بكەوێتەوە.. بڕیاری دا، خۆی تەرخان بكات بۆ كارێكی نوێ، وەكو پارێزەر، هەروەها نووسینەوەی ژیاننامەی خۆی، لە دووتوێی كتێبێكدا..

خوێنەری ئازیز.. سەرنج بدە، سەرۆكی وڵاتێكی گەورەی وەكو ئەڵمانیا، كاتێك بە ڕێژەیەكی زۆر كەم، شكست دەهێنێت بەرامبەر پارتی ڕكابەرەكەی، بێئەوەی كێشەو گرفتو ناڕەحەتییەك بۆ وڵاتەكەی، دروووست بكات، زۆر بەلایەوە ئاساییە، كە بگەڕێتەوە سەر پیشەكەی پێشووی، كە كاری پارێزەرییە..

ئەم خاڵە، تەنها ئەوە ناگەیەنێت، كە ئەوان ئاستی ڕۆشنبیریان، ئەوەندە بەرزە، بڕوایان بە دەستاودەستكردنی دەسەڵاتە، بەڵكو لە خاڵێكی دیكەدا، ئەوەمان پێدەڵێت، كە سەرۆكەكانی ئەوان، لە ماوەی دەسەڵاتیاندا، نابنە بازرگانێكی گەورەو پۆستەكەیان، بۆ كۆكردنەوەی سەروەتو سامانێكی بێشوماریش بەكارناهێنن، تا خۆیانو نەوەكانیان، پێویستیان بە كاركردنو خۆماندووكردن نەبێت، بەڵكو ئەوان، دوای تەواوكردنی خولی سەرۆكایەتییەكانیان، دەگەڕێنەوە سەر كارەكانی پێش سەرۆكایەتییانو دوور لە سیاسەتو دەستوەردان لە كاروباری دەوڵەتەوە، ژیان دەگوزەرێنن.

هیوام وایە، ئێمەش بگەینە ئەو ئاستەی، كە هەر كات متمانەی دەنگدەرانمان لە دەست دا، زۆر بەسانایی مامەڵە لەگەڵ دۆخەكەدا بكەینو بەبێ دروووستكردنی كێشەو ئاژاوە لە وڵاتدا.. بگەڕێینەوە سەر كاری ئاساییی خۆمان.

ئەوەش كورتەیەك بوو، لە ژیانی ئەو منداڵەی، كە بە بێباوكی گەورەبوو، بەڵام توانی ببێتە سەرۆكو ڕاوێژكاری وڵاتێكی پیسەسازی وەكو ئەڵمانیا.

# ڕێنمایی بەزمانی کوردی بنووسن!

بەهۆی پێشکەوتنی مرۆڤ، لە بواری زانستو داهێنانو درووستکردنی دەرمانو کەرەستەی کشتوکاڵی، هەروەها گرنگیدان بە تەندرووستی مرۆڤ، وایکردووە، سەوزەو میوەکان زۆربن، دانەوێڵەکان زیاتربن؛ بەهۆی کۆنترۆڵکردنی بەڵاو ئافاتە کشتوکاڵییەکانو پەیینی کیمیایی، هەرچەندە زۆرکەس گلەییان لەتامو بۆنی سەوزەو میوەی ئەم سەردەمە هەیە، زۆربوونی ژمارەی دانیشتووان، بەبەردەوامی وا دەکات پێویستی بۆ خۆراك زیاتربێت، هەبوونی ئامێری پێشکەوتوو، لەگەڵ هۆکاری گواستنەوەو ڕێگای نوێ بۆ هەڵگرتنو پاراستنی خۆراك، وای کردووە، بە درێژایی ساڵ، لە بازاڕەکاندا ئەو خۆراکەی ئارەزووی دەکەیت، دەستت بکەوێت. ئەگەر بەتازەییش نەبێت، ئەوا بەبەستوویی، یان بە لەقوتوونراویی هەیە.

باسەکەمان سەبارەت بە نەبوونی ڕێنماییو شێوازی بەکارهێنانە، بەزمانی شیرینی کوردی، لەسەر هەموو ئەو پێداویستییانەی کە هاوردەی هەرێم دەکرێن، تەنانەت ئەوانەشی کە لەناوەوەی هەرێم درووست دەکرێن، دەبینین بەزمانی عەرەبی، یان ئینگلیزی، لەسەریان دەنووسرێت. ڕەنگە سەیرکردنی ماوەی بەسەرچوونەکە، بەس بێت لەلای هاوڵاتی؛ بۆ دڵنیابوون لە شیاویی بەکارهێنان، بەڵام ئەو دەواودەرمانانەی ڕۆژانە بەکاریان دەهێنین، تەواو جیاوازە، کەسێك دەرمانی کشتوکاڵی بۆ لەناوبردنی گژوگیاو مێروو، بەکار دەهێنێت، تەنانەت پەیینی کیمیاییو هۆرمۆنو پرۆتینو دەرمانکردنی ئاژەڵو پەلەوەر، ناتوانێت سوود لەو ڕێنماییانە وەربگرێت، کە لەسەری نووسراوە، ئەوەی کارەکە قورستر دەکات، فرۆشتنی ئەم دەرمانانەیە، بەشێوەی فەلو هیچ ڕێنماییەکیان لەسەر نییە.

سەلامەتی کەسی بەکارهێنەر، زۆرگرنگە، ڕەنگە بەهەڵە بەکارهێنان، ببێتە هۆی لەناوبردن، یان ژەهراوییبوون، یان بەهۆی بەرکەوتنو هەڵمژینەوە، کاریگەری لەسەر دابنێت، چونکە زۆر دەرمان هەیە، لە جەستەدا، کەڵەکە دەبێتو کاریگەرییەکەی دواتر دەردەکەوێت، هەروەها بەکارهێنانی دەرمان بەشێوەی هەڵە، دەبێتە هۆی لەناوبردنی کشتوکاڵ، یان پەلەوەرو ئاژەڵو پیسبوونی ژینگە، ئەم حاڵەتەش، لە کوردستاندا، زۆر ڕوویداوە. لەئەنجامدا سەرچاوەی خۆراك، پیس دەبێتو کاریگەریی ڕاستەوخۆی دەبێت، لەکاتی خواردنی سەوزەو میوەو دانەوێڵە، یان گۆشتو شیرو هێلکەدا.

لەپاش بەکارهێنانی دەرمانی ڤرکەری مێروو، دەبێت کیسەکەی، یان ئەو بوتڵەی تێیدا بووە، لەناو ببرێت، بەڵام بەهۆی نەبوونی ڕێنماییو ئاگادارکردنەوە بەزمانی کوردی لەسەر دەرمانەکەو نەبوونی هۆشیاریی، هەروەها کڕینی دەرمانەکە، لەسەر عەرەبانەو لاکۆڵان، وەرنەگرتنی ڕێنمایی، کارەساتی دڵتەزێنی لێدەکەوێتەوە، ئەوەی جێی ئاماژەیە، زۆرینەی خەڵکی بوتڵو دەبەکان بەکار دەهێننەوە، بۆ هەڵگرتنی ئاو، شیر، دۆ، ماستو خواردەمەنی، تەنانەت دەبەی ڕۆنی ئۆتۆمبێل، ڤوتوو، شوشەی دەرمانی پزیشکی، بوتڵی دەرمانی پەلەوەرو ئاژەڵ، سەتڵی بۆیە ..هتد، بەکار دەهێننەوە، یان بەکارهێنانەوەی دەبەی ئاوی خواردنەوەو خواردنەوە گازییەکان، ئاوی تێدەکرێتو لە بەفرگردا دادەنرێتو دەیبەستێت، چەندین جار بەکار دەهێنرێتەوە، یان بۆ خواردنەوەی چاو شیری گەرم، بەکار دەهێنرێت، ئەمە کارێکی هەڵەیە، نابێت بەردەوام بین لەسەری. هەروەها لەکاتی دەرچوونو سەیراندا، زۆر کەس دەبەی ئاو بەکاردەهێنێت، بۆ هەڵگرتنی نەوت، بەمەبەستی بەکارهێنان لەکاتی ئاگرکردنەوەدا، بەڵام منداڵ کاتێك تینووی دەبێت، لەبری ئاو دەیخواتەوە، تووشی ژەهراویبوون دەبێتو خۆشییەکەیان لێ تێکدەدات.

بازاڕەکانی کوردستان، پڕن لە کەرەستەی بیانی، لەزۆر وڵاتی جیهانەوە، پێداویستی، هاوردەی هەرێمی کوردستان دەکرێت، خۆراكو داودەرمان، ئارایشت، پاککەرەوەکان، ئامێری کارەبایی، خواردنی بەستوو، لەقوتوونراو، بەڵام هیچ جۆرە نووسینو ڕێنماییەکیان لەسەر نییە بەزمانی کوردی، زانیاریو ڕێنماییەکان بە زمانی ئینگلیزی، عەرەبی، تورکی، فارسی، ئەڵمانی، چینی.. هتد، تەنانەت ئەو بەرهەمانەشی کە لەناوەوەی هەرێم درووست دەکرێن، زۆر بەکەمی زمانی کوردیان لەسەر دەبینرێت، ئەمەش وا دەکات، تاکی کورد بێبەش بێت؛ لە زانیاریی ئەو بەرهەمەی دەیکڕێت، لەڕووی پێکهاتنو چۆنیەتیی بەکارهێنان، هەروەها ئاگادارکردنەوە، بەتایبەتی بەشی هەرەزۆریان ئاگادارکردنەوەیان لەسەرە، کە نابێت لەبەردەستی منداڵدا دابنرێت، نابێت بەرچاو بکەوێت، مادەیەکی ژەهراوییە، سوتێنەرە، نابێت لە نزیك ئاگرەوە دابنرێت، بۆ منداڵی خوار تەمەن سێ ساڵ نابێت، لەپاش بەکارهێنان دەبەکەی بەکار مەهێنە، ..هتد. دەتوانرێت ڕێنمایی، یان ئاگادارکردنەوەیەکی کورت، لەسەر ئەو بەرهەمانە، بەزمانی شیرینی کوردی بنووسرێت، لەم ڕێگەیەوە، دەتوانین خزمەتێك بەزمانەکەمان بکەین، کۆمپانیاکانیش، ناچاربکەین زمانی کوردی بخەنە سەر بەرهەمەکانیان، هەروەها لە پرۆگرامی مۆبایلو تەلەفزیۆنو ئامێرەکانیاندا، بەکاری بهێنن.

لێرەدا کۆمەڵێك پرسیار دێتە پێشەوە:-

- زۆر لەو بەرهەمانە، بە ناوی کۆمپانیاکانی ئێرەوە، دروست دەکرێن، لەسەر خواستو داواکاریی ئەوان درووست دەکرێن، ئایا ناتوانن داوا بکەن، هەندێك ڕێنمایی بە زمانی کوردی لەسەر بەرهەمەکە هەبێت؟

- ئایا لایەنی پەیوەندیدار، لە حکومەت، بیری لە وەها بابەتێکی گرنگ، کردووەتەوە؟

- ئایا نەبوونی زانیاریو ڕێنمایی، بە زمانی کوردی، دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی، ئێمە لەم بوارەدا، پێشینەیەکمان نەبووەو بەرهەمەکان دەرەکین؟

- ئەم بابەتە بەگرنگ نازانین، یان هەبوونی زمانی کوردی، لەسەر بەرهەمێك، لە نرخەکەی دادەبەزێنێت؟

جەلال عەبدوڵا حاجی



# جان جاك ڕۆسۆ (١٧١٢ - ١٧٧٨)

ئالانی

**شکستخواردووەکان دووبەشن: بەشێکیان، بیر دەکەنەوەو کار ناکەن.. بەشێکی دیکەیان، کار دەکەنو بیر ناکەنەوە.**

جان جاك ڕۆسۆ لە «٢٨ی حوزەیرانی ساڵی ١٧١٢»، لە وڵاتی جنێف، کە ئێستا پێی دەوترێ: سویسرا لەدایکبووە، ڕۆسۆی فەیلەسووفو نووسەرو ڕووناکبیر، فەلسەفە سیاسییەکەی، کاری کردە سەر شۆڕشی فەرەنسی، سیاسەتی هاوچەرخ، کۆمەڵناسی، بیری پەروەردەیی. باوکی «ئیزاك ڕۆسۆ» سەعاتچییەکی ناسراو بووە، دایکیشی «سۆزان بێرنارد» بە هەفتەیەك دوای لە دایکبوونی ڕۆسۆ، ماڵاوایی لە ژیان دەکات، ئیدی سەرپەرشتیکردنو بەخێوکردنی ڕۆسۆ، دەخرێتە ئەستۆی کەسانی دی. ژیانی ڕۆسۆ، لە سەرەتای لەدایکبوونییەوە، تا ماڵاوایی لە ژیان، بە ناڕەحەتیو دەربەدەرییو نەهامەتیو کەساسی دەناسرێتەوە، چونکە بە لەدایکبوونی ڕۆسۆ، دایکی کۆچی دوایی دەکات، وەك خۆی دەڵێت، لەدایکبوونی من، بە مردنی دایکم، دەستی پێکرد..

بەڵام نەهامەتیو ناڕەحەتییەکانی ژیان، چۆکی بە ڕۆسۆ دانەدا، بەڵکو ڕۆسۆ، هەر لە منداڵییەوە، خولیاو عاشقی پەرتووكو خوێندنەوە دەبێت، بە جۆرێك، کە هەر لە تەمەنی پێنج ساڵییەوە، دەستی کردووە، بە کتێب خوێندنەوەو تاکۆتایی ژیانی، لە خوێندنەوە بەردەوام بووە، خۆشەویسترین نووسەر، لەلای ڕۆسۆ (پلوتارك) بووە. پاش بەسەربردنی چەندین ساڵ، لە تەمەنی بە تاراوگەو گەڕان بە شارەکاندا، ڕۆسۆ خەریکی توێژینەوەی توانستەکانی خۆی دەبێت، سەرەتا بە فەلسەفە دەست پێدەکات، فەیلەسووفەکانی وەك (جۆن لۆكو مالێبرانژو دیکارتو لایبنیتسو ڤۆڵتێر) دەخوێنێتەوە، ژیانی ئەم ساڵانەی ڕۆسۆ، پڕە لە گەڕان بە نێو ئیتاڵیاو فەرەنساو سویسرادا. فەیلەسووفی فەرەنسی، یاخود بڵێین (سویسری)، گرنگترینو ناودارترین نووسەری سەردەمی خۆی بووە.

سەبارەت بە نەهامەتیو کەساسیی خۆی، لە کتێبی (دانپێدانانەکان)دا دەڵێت: من بە نەخۆشیو لاوازی لەدایك بووم، دایکم ژیانی لە پێناوی مندا بەخت کرد، لەدایك بوونم، یەکەم کارەساتی ژیانم بوو).

هێشتا تەمەنم نەگەیشتبووە شەش ساڵان.. باوکم چیرۆکەکانی پێشینانو کتێبە فەلسەفییەکانی، وەکو خیتابی لە مێژووی گشتیدا، بۆ دەخوێندمەوە، لەگەڵ دانراوەکانی ڤۆڵتێرو پلوتارك.

لە ساڵی ١٧٢٢ ناچارکرا، کە جنێف جێ بهێڵێت، لێرەوە دووبارە دەربەدەریو ناڕەحەتییەکانی ژیانی ڕۆسۆ، دەستی پێکردەوە، ئەوەش بووە هۆی ئەوەی، کەسایەتییەکی ئاڵۆزی لێ دەربچێت، ڕۆسۆ چووەتە قوتابخانە، بەڵام تەنها دوو ساڵ، لە قوتابخانە ماوتەوە، ناچاربوو واز لە خوێندن بهێنێت، دوای ئەوەی ئازارێکی زۆردراو ستەمی لێکرا. دوای قوتابخانە، ڕۆیشتە بەردەستی یەکێك لە نیگارکێشەکان، بۆ ئەوەی فێری پیشەی نیگارکێشی ببێت. بەڵام ستەمو چەوسانەوەی مامۆستاکەی، ناچاری کرد، کە لەو کارەشی

وازبهێنیت. دواتر گەڕایەوە بۆ جنێف.

دوای ماوەیەکی کورت لە چوونی بۆ جنێف، کە ئەو کات، لە تەمەنی پانزە ساڵیدا بوو، ڕۆسۆ گەیشت بە خاتوو (لویز دیوارنز)، کە ئەو بێوەژنێکی دەوڵەمەند بوو، لە ژێر کاریگەریی ئەم ئافرەتەدا، ڕۆسۆ چووە کەنیسەی ڕۆمانی کاسۆلیکی، هەرچەندە ڕۆسۆ، سیازدە ساڵ لە خاتوو دیوارنز بچووکتربوو، لەگەڵ ئەوەشدا، لەگەڵیدا مایەوە، ڕۆسۆ لە کتێبی دانپێدانانەکەیدا باس لە بەختەوەریی خۆی دەکات لەگەڵ خاتوو دیوارنز، بەڵام ژیانیان تاسەر بەردەوام نەبوو، لە کۆتاییدا ڕۆسۆ، لە ساڵی ١٧٤٠ لێی جیابووەوە، ڕۆسۆ بە هۆی پێداویستی بۆ ماڵو سامان، زۆر کاری کردووە، دواتر لە ساڵی ١٧٤٠ بۆ ١٧٤٢ هەوڵی فێربوونی مۆسیقای دا.

خاڵی وەرچەرخان لە ژیانی ڕۆسۆ، ساڵی ١٧٤٩ بوو، کاتێك لە پێشبڕکێیەکی زانستی بەشداری کرد، بەسەرپەرشتی ئەکادیمیای دیجون جول، ڕۆڵی ڕاپەڕینی زانستیی‌و هونەری لە تێکدانی ئاکارو ڕەوشتو چاکسازی.

بە وتارێك بەشداری کرد لە پێشبڕکێکەدا، کە بریتی بوو لە (خیتاب لە زانستو هونەردا)، توانی خەڵاتی ساڵی ١٧٥٠ بەدەستبهێنێت، ئەمەش ڕۆسۆی بەرەو ناوبانگێکی گەورە ڕاکێشا، کە هانی دا، بەردەوام بێت لە نووسین..

دواتر ڕۆسۆ، بەشداری لە پێشبڕکێیەکی دیکەی زانستیدا کرد، سەبارەت بە بناغەی جیاوازیی نێوان مرۆڤەکان.. وتارێکی نووسی، بەناونیشانی (پەیامی جیاوازی، لە نێوان مرۆڤەکاندا)، لە ساڵی ١٧٥٥، هەروەها لە ساڵی١٧٥٦ دەستیکرد بە تەواوکردنی هیلویز، هەروەها دەستی کرد بە دانانی دوو کتێبی بەناوبانگ: (پەیمانی کۆمەڵایەتی) و (ئیمێڵ)، کە هەردوو کتێبەکە، لە ساڵی ١٧٦٢ چاپکران.. پاشان فەرهەنگێکی مۆسیقای، لە ساڵی ١٧٦٧ بڵاو کردەوە.

هەرچەندە دانراوەکانی ناوبانگێکی فراوانو بڵاویان پەیداکردو هەردوو کتێبەکەی «پەیمانی کۆمەڵایەتی، ئیمێڵ» پێشوازییەکی زۆریان لێکراو خوێنەرێکی زۆریان هەبوو، بەڵام ئەم دوو کتێبە ڕەخنەی توندی موسوڵمانانو مەسیحییەکانو فەیلەسووفەکانی بەدوای خۆیدا هێنا، لەبەرئەوە پەرلەمانی پاریس، تەنها دوای بیست ڕۆژ لە چاپکردنی کتێبەکانی، بڕیاری سوتاندنی هەردوو کتێبەکەو زیندانی کردنی نووسەرەکەی، واتە «ڕۆسۆ» دەرکرد..

ڕۆسۆ ناچاربوو کە ڕابکات بەرەو وڵاتی سویسرا، دووبارە لە وڵاتی سویسراش هەمان بڕیار بۆ هەردوو کتێبەکەی درا.

ڕۆسۆ ناچار پەنای برد بۆ وڵاتی ئینگلتەرا، ناسیاوێکی بەناوی (دافید هیوم) هەبوو، بووە میوانیو ماوەیەك لە ماڵی ئەوان مایەوە.. بەڵام زۆری پێ نەچوو، ڕۆسۆ لەگەڵ ئەویشدا، ناکۆکی کەوتە نێوانیانەوە، ناچار گەڕایەوە بۆ فەرەنساو دەستیکرد بە نووسینەوەی یادەوەرییەکانی ژیانی، تا ئەو کاتەی ماڵاوایی لە ژیان کرد.

ڕۆسۆ لەو باوەڕەدا بوو، کە مرۆڤ بە سرووشتی خۆی، بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتی نییە، بە بەڵگەی ئەوەی؛ ئەگەر هەر کەسێك، لەسەر سرووشتی خۆی بژی، دوور لە کۆمەڵگا، دەبێتە کەسێکی دڵنەرم، خاڵییە لە هەر تۆوێکی خراپو ئازاردانی کەسانی دی، دوورە لە شەڕانگێزیو خراپەو کاولکاری، بەڵام ئەو کەسەی لەگەڵ کۆمەڵگەدا، ژیان دەگوزەرێنێت، دەبێتە کەسێکی شەڕانیو حەز بە ئازاردانی کەسانی دی دەکات.. ڕۆسۆ پێی وایە: کۆمەڵگە، تاکەکان خراپ دەکات، لە ڕێگەی ئەو کەلتورو نەریتەی لە ناو کۆمەڵگەدا پیادە دەکرێت.. لە کۆمەڵگەدا، مرۆڤەکان هان دەدرێن، بۆ شەڕەنگێزیو خۆپەرستی.

ڕۆسۆ ئامۆژگاری خەڵکی ناکات، کە بگەڕێنەوە بۆ سرووشتی تەنیایی، بەڵکو ڕۆسۆ، لەو باوەڕەدایە کە خەڵکی بە هۆی فراوانییانەوە، ئەگەر لە کۆمەڵگەیەکی سادەو ساکاردا ژیان بگوزەرێنن، کە سەرقاڵن بە کشتوکاڵکردنەوە.. بەشێوەیەك هیواو حەزو ئارەزووەکان، لەم کۆمەڵگایانەدا سنووردارن، پاڵنەرە سێکسییەکانو ڕەوشتە نەرێنییەکانو خودپەسەندی، لەو جۆرە کۆمەڵگایانەدا، ناپەسەندو مەحکومە.. لەبەرئەوەی هەموو وزەو تواکانی مرۆڤ، سەرقاڵبوونە بە ژیانی کۆمەڵایەتییەوە.

لەو کتێبانەیدا، کە باس لە سیاسەت دەکات، ڕۆسۆ وێنەی چەند هێلکارییەك دەکێشێتو دەڵێت: دەبێت سەرجەم هاوڵاتیان، بەشداری بکەن بۆ دامەزراندنی ژیانێکی ئازادانە.

ڕۆسۆ دوای ململانێیەکی سەخت لەگەڵ ژیاندا، لە (٢ تەمموزی ساڵی ١٧٧٨)، دوای ئەوەی شوێنەوارێکی گەورەی بەجێهێشت؛ لە بواری سیاسەتی جیهانیو جێبەجێکردنی ئاشتیو ئازادی لە وڵاتەکەیدا.

تا ئێستاش بیروبۆچوونەکانی ڕۆسۆ، لە زۆرێك لە زانکۆکانی جیهاندا دەخوێنرێنو گفتوگۆ لەسەر بیردۆزەکانی ڕۆسۆ دەکرێت؛ لە بواری فەلسەفەو سیاسەتو یاسادا. تا ئەمڕۆش مشتومڕو گفتوگۆ، لەسەر بیردۆزەکانی بەردەوامە.

ڕۆسۆ یەکێکە لەو فەیلەسووفانەی، کە زۆر سەرسام بووە بە پێغەمبەر موحەممەد (سەلامی خوای لێبێت)، لە بارەیەوە دەڵێت:

تا ئەمڕۆش، لە جیهاندا نەبینراوە، پیاوێك بتوانێت، کە عەقڵەکانو دڵەکان، لە پەرستنی بتەکانەوە، بۆ پەرستنی خودای تاكو تەنها بگۆڕێت، جگە لە پێغەمبەر موحەممەد (درودی خوای لێبێت)!

# جوانترین دیاری چییە؟

## تا دڵی خەسووم بەدەست بهێنم

ئا: خەرمان عەبدولکەریم



هەروەك دەزانین، چیرۆكی بووكو خەسوو، هەر لە دێرزەمانەوە، بە چیرۆكی ڕقوكینە، گوزارشتی لێكراوە، كە پێكەوە ناتوانن، لە ماڵێكدا هەڵبكەن، بۆیە ئەم باسە، تا ڕادەیەك، لە ئێستادا نەك نەماوە، بەڵكو كەم بۆتەوە، بێگومان ئەم هەستە، هەر لەسەرەتای هاوسەرگیرییەوە دروست دەبێت، بەوەی ئایا دایكی هاوسەرەكەت، بەخەسوو بزانیت، یاخود وەك دایكێك، كە هاوسەرەكەتی هێناوەتە دونیاوە؟

ئەگەر لەدەروونتدا، وات هەستكرد؛ خەسووت ڕقی هەیە بەرامبەرتو پێت ناڵێت، باشترین فرسەت ئەوەیە، كە لە ڕۆژی جیهانی دایكدا، دڵخۆشی بكەیت، بەجوانترین دیاری، بەڵام ئەو دیارییەی كە هەمیشە خەسوو، دڵی پێی خۆش دەبێت، تا بزانێت تۆ چەند گرنگی بە خەسووت دەدەیت، هەروەك دایكی خۆت، تەماشای دەكەیت.

ئەگەر نەتزانی خەسووت، زۆر حەزی لەچییە، دەتوانیت پرسیار لە هاوسەرەكەت، یاخود كەسێكی نهێنیپارێز بكەیت، تا نهێنییە چاوەڕواننەكراوەكە، ئاشكرا نەبێت، تا كاتی دیاریكراو، یاخود دەتوانیت، خۆت جوانترین دەستەگوڵی سرووشتی، كە بەجوانترین شێواز، پێچرابێتەوە، پێشكەشی بكەیت، لەگەڵ كارتێكی ناسك، كە پڕ بێت لەو هەستانەی، كە ڕاستگۆیی تۆ پیشان بدات، كە خۆشت دەوێت، وەك دایكی خۆت.

یاخود وەك بۆنەیەكی تایبەت، ماڵ بڕازێنیتەوەو كێكێكی جوان دروست بكەیت، تا خەسووت هەست بكات، ماندوبوویت بە ئامادەكردنی ڕۆژێك، لە خۆشییەكانی دایكان، وەك بووكێكی میهرەبان.

یاخود ئەگەر خەسووت، حەزی لە بابەتی سەردەمو تەكنەلۆجیا بوو، دەتوانیت دیاریی ئەو ڕۆژەی تۆ، بۆ خەسووت مۆبایلێكی سەردەمیانە بێت، یاخود دەتوانیت جلوبەرگی جوانو ناوازەی لە ماركە بەناوبانگەكان، پێشكەش بكەیت، ئەگەر گرنگیشی بە كەرەستەی مەتبەخو جوانكاریی ناوماڵ دا، ئەوا كەرەستەیەكی زۆر نایابی پێشكەش بكە، تا بتوانیت، دڵی خەسووتو هاوسەرەكەشت، بۆ خۆت كەمەندكێش بكەیت، بەوەی كە بڵێیت: ئەگەر پێش هاوسەرگیریم، دایكێكم هەبووە، ئەوا ئێستا خاوەنی دوو دایكم.

ئەمەش لە ڕێگەی چەند خاڵێكەوە دەبێت:-

١- گوێنەگرتن لەو كەسانەی، كە بەردەوام ناوی خەسوویان، لەسەردەمیانە، بەشێوازێكی خراپ باسی ژیانی ماڵە خەزوورانیان دەكەن.

٢- هەوڵدان بۆ ئەوەی هەمیشە، كێشە خێزانییەكان، لای خەسووت باس بكەیت، نەك لای كەسێكی تر، چونكە خەسووت، باشترین دەروازەیە، بۆ كردنەوەی گرێكوێرەكان.

٣- دانیشتن لەگەڵ خەسووتدا، خۆشترین كاتەكان بێت لات، نەك ئەوەی بەردەوام خەسووت، وا هەست بكات، هەمیشە بێزاریت، كاتێك سەردانیان دەكەیت.

٤- لەگەڵ هاوسەرەكەتدا، هەمیشە باسی چاكییەكانی دایكی بكە، نەك ئەگەر قسەیەكی كرد، بەردەوام بە هاوسەرەكەت بڵێیت: دایكت، ئەم قسەیەی پێ گوتم، وا دابنێ، گوێت لە قسە ناخۆشەكان نەبووە، لەبری گێڕانەوەی قسە ناخۆشەكان، قسە خۆشەكانی، بۆ هاوسەرەكەت باس بكە.

٥- دەربڕینی خۆشەویستی، با لە كارە لەپێشینەكانت بێت بۆ دایكی هاوسەرەكەت، چونكە ئەگەر هاوسەرەكەت، لا گرنگ بێت، ئەوا بەدڵنیاییەوە، خۆشییەكانت بۆی دەوێت، بەخۆشویستنی كەسوكارەكەی.

بێگومان بەم شێوەیە، ژیان سەرجەم دەرگاكان، بە ڕووی خۆشگوزەرانیی هەردوو خێزاندا دەكاتەوە، چونكە دڵنیابە لەوەی كورد وتەنی: (چی بچێنیت، هەر ئەوە دەدووریتەوە)، ئەگەر تۆ باش بیت، ئەوا هاوسەرەكەشت، هەمیشە ڕێزو خۆشەویستیی تۆ، بۆ خێزانەكەی هەست پێدەكات، ئەویش بەهەمان شێوە، مامەڵە لەگەڵ ماڵی باوانی تۆدا دەكات، ئەگەر پێچەوانەش بیت، ئەوا هەر بەهەمان شێوەی تۆ، ئەویش هەڵوێستی دەبێت.

سوود لەم سەرچاوەیە وەرگیراوە: حیاة المرأة.



# بۆ ئەوەی منداڵەکەت خۆشی بوێیت...

و: بێگەرد فارس

١- تایبەتکردنی هەندێك كات، لەگەڵ منداڵەکانتدا، پێکەوە نانخواردنی دەرەوە بێت، یاخود وەرزشکردن، وەك پیاسەکردن، یان مەلەکردن، یاخود تۆپێن.

٢- لە ناخیاندا، متمانە بەخۆبوون بچێنە، بەهاندانو پێزانینی ئەو کارانەی، پێی هەڵدەستن، نەك ئەنجامی کارەکانیان، وەك زۆرێك لە باوان پێی هەڵدەستن.

٣- دەستخۆشیکردن، یان بەخشینی دیاری لە بەرامبەر هەر کارێکی باش، کە ئەنجامیان داوە، بەشێوەیەك بەسەریاندا تێپەڕ نەبێت، وەك بڵێی کارێکی ئاسایی ڕووی داوە، چونکە بۆ منداڵ، گرنگترین ڕووداوی ژیانییەتی، هەربۆیە گرنگی باوانیش، زۆر پێویستە.

٤- بیرکردنەوەی ئەرێنی، فێری منداڵەکانت بکە، تۆ ئەرێنییانە، مامەڵەیان لەگەڵدا بکە، بۆ نموونە: کاتێك دەبینیت؛ لە قوتابخانە گەڕاوەتەوەو جلەکانی پیسکردووە، لە بری ئەوەی لێی تووڕە ببیت، پێی بڵێ: دیارە ئەمڕۆ ڕۆژێکی خۆشت بەسەر بردووە لە قوتابخانە.

٥- ئەلبوومی وێنەکانیان پیشان بدەو چیرۆکی ئەو ماوەیەی لە یادیان نییە، بگێڕەوە.

٦- باسی ئەو شتە بکە، کە لەوانەوە فێربوویت، پێیان بڵێ: چەند خۆشحاڵیت، لە کاتێکدا ئەوان منداڵی تۆن.

٧- ڕێگە بدە منداڵەکان، ئەو جلانەی لەبەری دەکەن، خۆیان هەڵیبژێرن، یان ئەو یارییانەی دەیانەوێت بیکەن، بەو جۆرە تۆ، پیشانیان دەدەیت، چەندە ڕێز، لە بڕیارو ئارەزووەکانیان دەگریت.

٨- بەجۆرێك تێکەڵیان بە، وەك بڵێی هەمان تەمەنو وەك ئەوان ڕەفتاربکە.

٩- ڕۆژانە ئاگادارییان بە، بە جۆرێك خشتەی وانەکانیان، مامۆستاکانو هاوڕێکانیان بناسیت، بۆ ئەوەی کاتێك دەگەڕێنەوە بۆماڵەوە، بە شێوەیەکی گشتی، نەپرسی: "ئەمڕۆتان چۆن بەڕێ کرد؟"بەڵکو بپرسە فلان هاوڕێت، یان فلان مامۆستات، بۆ ئەوەی هەست بکات، گرنگی بە هەموو بوارەکانی دەدەیت.

١٠- کاتێك منداڵەکەت، دەیەوێت قسەت لەگەڵدا بکات، خۆت بە ئیشو کارەوە، سەرقاڵ مەکە، یان سەیری تیڤی مەکە، بەڵکو بە تێڕامانەوە، کاتێك دەدوێت سەیری چاوەکانی بکە، کاتێك کۆ دەبنەوە، تەنها گوێگر مەبە، تۆش بەسەرهاتێك باس بکە، یان هاوبەشی گفتوگۆکانیان بە.

١١- لە پەڕەیەکی بچووکدا، وشەیەك بۆنی خۆشەویستی، یان هاندان، یان نوکتە بدات بنووسەو لە جانتای قوتابخانەی، یاخود سەرجێگای نووستنی دابنێ، لە کاتێکدا تۆ دەتەوێت بچیتە دەرەوەو ئەوان خەوتوون، تا هەست بکەن، ئەو ساتانەش لەگەڵیاندا نیت، بیریان لێ دەکەیتەوە.

١٢- کاتێك وێنەیەك دەکێشن، لە شوێنێکی تایبەت هەڵی بگرەو شانازی خۆتیان بۆ دەرببڕە.

١٣- بە شێوەیەك، لەگەڵ منداڵەکانتدا، ڕەفتار مەکە؛ وەك ئەو ڕەفتارەی باوانت، لەگەڵ تۆیاندا کردوویانە، چونکە دەکەویتە ناو هەڵەیەکەوە، کە دەبێتە هۆی دارمانی دەروونی منداڵەکەت.

١٤- کاتێك منداڵەکانت، هەڵەیەکیان کردووە، پێیان مەڵێ: بە هەڵە کارەکەت کردووە، بەڵکو بەشێوەی پرسیار پێی بڵێ: بۆچی بەو ڕێگەیە ئەنجامی نادەیت؟ ڕێگەکەش ئەو ڕێگەیە بێت، سەرەڕای ڕاستیو درووستی، دەبێت بۆ تەمەنی ئەو، گونجاو بێت.

١٥- لە ئامێزیان بگرەو ماچیان بکە، پێیان بڵێ: چەندە خۆشت دەوێنو بە بوونی ئەوان چەندە ئاسوودەیت، بەبێ گوێدانە تەمەنیان، تەنانەت ئەگەر منداڵیشیان هەبێت، هێشتا ئەوان منداڵی تۆن.

١٦- هەرگیز بیرت نەچێت، هەمیشە زەردەخەنەت لەسەر لێوان بێت، کاتێك سەیرت دەکەن، چونکە زەردەخەنەکەت بۆ ئەوان، مانایەکی گەورەی هەیە.

سەرچاوە: سایتی فتکات



# داوای لێبوردن، جادوو دەکات!

ئەسکەندەر ڕەحیم

دکتۆر جاسم موتەوەع، کە لە وڵاتە عەرەبییەکاندا، پەروەردەکارێکی شارەزاو بە ناوبانگە، دەڵێت: جارێکیان، لەکاتی پێشکەشکردنی خولێکی تایبەت بە پیاواندا، سەرنجی پیاوێکم دا، ڕەنگو ڕووی گۆڕدرا، فرمێسک لە چاوییەوە جۆگەلەی بەستو کەوتە سەر ڕوومەتەکانی، منیش لەو دەمەدا، باسی ئەوەم دەکرد، لەگەڵ منداڵەکانماندا، چۆن هەڵسوکەوت بکەینو چۆن لەهەڵەکانیان، سەرودەر بکەینو چۆن گرفتەکان، گیرۆدەتر نەکەین.

لەکاتی پشوودانی خولەکەدا، ئەو پیاوە، هات بۆ لامو بەتەنیا قسەی لەگەڵدا کردمو گوتی: ئایا دەزانیت، بۆچی بابەتی خولەکە، کاری تێکردمو بەکوڵ گریامو فرمێسکم هەڵڕشت؟

گوتم: نازانم!

گوتی: من کوڕێکی حەڤدەساڵانم هەیە، پێنج ساڵە، قسەم لێ دابڕیوە، چونکە لەگەڵ هاوڕێی خراپدا دەگەڕا، جگەرەی دەکێشا، بەدڕەفتار بوو، سەری بە فەرزی خودادا نەدەدا، بێفەرمانی دەکردمو ڕێزی دایکی نەدەگرت.. ئیدی بۆئەوەی بێتەوە سەر ڕێ، پەیوەندیم لەگەڵیدا پساندو خەرجیم لێگرتەوەو ژوورێکم لە سەربان بۆ کردەوە.. بەڵام دەستی لە خووە خراپەکانی، هەر هەڵنەگرتووەو نەگرتووە، بگرە سوورتریش بووە لەسەریان. ناشزانم چ بکەم، بەڵام قسەکردنت لەسەر ئەوەی، کە گفتوگۆ زۆر گرنگەو بۆ چارەسەری گرفتەکانو چارەسەرێکی ئەفسووناوییە، زۆر کاری تێکردم، جا ئێستە ڕێنماییی تۆ، بۆ من چییەو دەفەرموویت من چی بکەم؟ ئایا لە قسەدابڕین لەگەڵیدا بەردەوام بم، یان پەیوەندی لەگەڵدا پێکبێنمەوە؟ ئەگەر پێیشم بڵێیت، بگەڕێرەوە بۆ لای، ڕێچارە چییەو چۆنە؟

منیش پێم گوت: هەر ئەمڕۆ، پێش ئەوەی سبەی دابێت، دەبێت پەیوەندی لەگەڵیدا ببەستیتەوە. ڕاستە، ئەوەی منداڵەکەت کردوویەتی، هەڵەیە.. بەڵام دابڕینی پەیوەندیشت لەگەڵیدا، هەر هەڵەیە، پێی بڵێ: قسەلێدابڕینو پەیوەندی پساندنی من لەگەڵ تۆدا، کارێکی هەڵە بووە.. کوڕی شیرینم، تۆش دەبێت لە ئاست دایكو باوکتدا، کوڕێکی چاك بیتو لە گوفتارو ڕەفتارتدا، ڕێکوپێك بیت، نەك خواروخێچ.

پیاوەکە بەسەرسوڕمانەوە گوتی: من باوکی ئەوم، چۆن داوای لێبوردنی لێبکەم؟! خۆ ئێمە، وەها پەروەردە نەکراوین، کە گەورە، لە بچووك، یاخود باوك، لە ڕۆڵەکەی خۆی، داوای لێبووردن بکات؟!

گوتم: کاکەگیان، هەڵەو تاوان، گەورەو بچووك، باوكو کوڕ، ناناسێت، لەبەرئەوە پێویستە تاوانبار (هەر کەسێك بێت) داوای لێبووردن بکات.

دیار بوو، قسەکانمی بەدڵ نەبوو، درێژەمان بە خولەکەمان داو ڕۆژی یەکەمی تەواو بوو.

ڕۆژی دووەمی خولەکە، باوکەکە بە دڵو ڕووی خۆشەوە، هاتەوەو منیش بە خۆشحاڵییەکەی، خۆشحاڵتر بوومو گوتم: چ باسە؟

گوتی: لە کاتژمێر دەی شەودا، لە دەرگای ژووری کوڕەکەمم داو کاتێك دەرگاکەی کردەوە، پێم گوت: ڕۆڵەگیان، قسەدابڕینو پەیوەندی پساندنی من لەگەڵ تۆدا، بۆ ماوەی پێنج ساڵ، هەتا بڵێیت هەڵە بووە، من داوای لێبووردنت لێدەکەم کوڕی شیرینم، توخودا بمبەخشە جەرگی بابە.

کوڕەکەم، ئەم کارەمی، زۆر پێ سەیر بوو، سەری هاویشتە سەر سینگمو دەستیکرد بە گریان.. منیش، ئاگری جەرگ هەڵیگرتم، کوڵی گریان گرتمی، لەگەڵیدا دەستم کرد بە گریان.

پاشان کوڕەکەم گوتی: بابەگیان، هەرچییەکت لێم دەوێت، ئەمن نافەرمانیی تۆ ناکەمو لە ئاست فەرمانی چاکەی تۆدا، دەڵێم: بیستمو گوێ لە مستم.

ئەمەش بوو بە مایەی خۆشحاڵیی بەشداربووانی خولەکە.

بەڵێ، هەڵەو تاوان، گەورەو بچووك ناناسێت؛ ئەگەر باوك، یان دایك، لە هەقی منداڵەکانیدا، هەڵەی کرد، پاشان داوای لێبوردنی لێکردن، ئەوا بەم ڕەفتارەی، فێری داوای لێبوردنیان دەکات، کاتێك دەکەونە ناو هەڵەوە.. خۆ ئەگەر داوای لێبوردن نەکات، ئەوا بەبێئەوەی هەستی پێبکات، فیزو خۆبەزلزانینیان تێدا دەڕوێنێت!



# سەرەتایەکی گرنگ

منداڵێکی تەندرووست

گوڵان حەمەئەمین

خۆشەویستان لە ژمارەکانی ڕابووردوودا، باسمان لە مامەڵەکردن لەگەڵ منداڵدا کرد، لە پێش لەدایکبوونییەوە، تا چوونە قوتابخانەو تەمەنی حەوتساڵ. ئەزیزان، بیرتان دەهێنمەوە، کە توێژینەوەکان پێمان دەڵێن: منداڵ لە ژینگەی سکی دایکیەوە، ژیریی نەستی کار دەکات، مامەڵەو پەیامەکانی دەوروبەر، کاردانەوەی دەبێت لەسەر هەستو نەستی منداڵ.

ئازیزان، بێگومان تەمەنی حەوت ساڵی، تەمەنێکی گرنگەو دەستپێکی پەروەردەیە، وەك بناغەیەك وایە، بۆ سەقفی تەلارێك، بەهێزیی ئەم تەلارە، پەیوەستە بە بەهێزیی بناغەکەیەوە.

گرنگترین هۆکارەکانیش، پەیوەندییەکی پتەوی تەمەنی پێش حەوت ساڵییە، ئەم پەیوەندییە پتەوەش، چۆن درووست دەبێت؟

بە خۆشەویستییەکی زۆرو بایەخپێدانی، بە خۆشەویستییەکی زۆرو بایەخپێدانی، سێبارە بە خۆشەویستییەکی زۆرو بایەخپێدانی.

یاریکردن لەگەڵیدا، یاریکردن لەگەڵیدا، سێبارە یاریکردن لەگەڵیدا!

جێی خۆیەتی، خوێنەری خۆشەویست، بپرسێت: ئایا تا تەمەنی حەوت ساڵی، هیچ ڕەوشتو ئاکارێکی فێر ناکەیت؟!

بەڵێ، بێگومان فێری دەکەین، بەڵام بە شێوازێك، کە گونجاو بێت، لەگەڵ تەمەنی منداڵدا، بەشێوازی چیرۆك، بەشێوازی یاریکردن، ڕۆڵ نواندن، تا ئەو ئاستەی، کە منداڵ گەیشتە تەمەنی حەوت ساڵی، تەواوی خواستی یاریکردنو گرنگی پێدانی تێربووبێت، جا لەگەڵ هەرکەسێکدا بێت، ئەوا ئەو کەسە، دەبێت بە کلیلی دەرگای دڵی ئەو منداڵەو بەئاسانی، دەتوانێت خۆی لە دڵیدا جێگیر بکات.

کەواتە: کێ دەتوانێت منداڵ پەروەردە بکات؟

بێگومان ئەو کەسەی کە توانیویەتی، پەیوەندییەکی بەهێز، لە نێوان خۆیو منداڵەکەدا درووست بکات.

زۆرجار دایكو باوك، سکاڵای ئەوە دەکەن، کە منداڵەکانیان، بە گوێیان ناکەن!

ئازیزان، منداڵ تۆڵەسەندنەوە نازانێت، بەڵام لە قسەی ئەو کەسەش لانادات، کە ئارەزووی یاریکردنو بایەخپێدانی تێرکردووە!

بۆئەوەی بتوانیت، زۆرترین کاریگەریت، لەسەر منداڵەکەت ببێت..

بۆئەوەی منداڵەکەت، بەو شێوەیە مامەڵە بکات، کە تۆ دەتەوێت.. بۆئەوەی بە پەروەردەی خۆت، پەروەردە ببێت..

پێویستە، تا تەمەنی حەوت ساڵی، زۆرترین بایەخ، بە یاری لەگەڵ کردنیدا بدەیت، بە هەر شێوەیەك پێی خۆشەو گونجاوە، لانی کەم، کاتێکی بۆ تەرخان بکە.

# دادپەروەریی ئاسمان..
## چیرۆکی ئافرەتێکی داوێنپاكو ڕەوشتبەرز..

خەتاب لە کتێبەکەیدا، بەناوی دادپەروەریی ئاسمان، باس لە چیرۆکی ئافرەتێکی کەموێنەو پاڵەوانو ڕەوشتبەرز دەکات.. خەتاب بەم شێوەیە، چیرۆکی ئەو پاڵەوانە دەگێڕێتەوە:-

قەصابێك، کە بە پیشەی قەصابی ـ واتە «سەربڕینی ئاژەڵو فرۆشتنی گۆشتەکەی» ژیانو بژێویی خۆیو خانەوادەکەی پەیدا دەکرد.. ئەو وەکو نەریتی هەمیشەیی، هەموو بەیانییەك، پێش نوێژی بەیانیان، دەڕۆیشت بۆ شوێنی کارەکەیو چەند سەر ئاژەڵێکی سەردەبڕیو پاشان دەگەڕایەوە بۆ ماڵەوە، لەگەڵ خێزانەکەی نانو چای بەیانیانی دەخواردو پاش هەڵاتنی خۆر، جارێکی دیکە دەڕۆیشتەوە بۆ کردنەوەی دوکانەکەی، بەمەبەستی فرۆشتنی گۆشتی ئەو ئاژەڵانەی، کە لە بەیانی زوودا سەری بڕیون.

قەصاب، بەم شێوەیە، ژیانی ڕۆژانەی دەگوزەراند.. ئەو جگە لەسەرقاڵبوون بە کاروپیشەکەی خۆیەوە، خۆی بە هیچی دیکەوە، خەریك نەدەکرد.. کەسێکی باشو سەرڕاست بوو.. خەڵکی ناوچەکە، بۆ کڕینی گۆشت، ڕوویان لە دوکانەکەی دەکرد.

شەوێکیان دوای ئەوەی ئاژەڵەکانی سەر بڕی، گەڕایەوە بەرەو ماڵ «وەکو دەزانن جلوبەرگی قەصاب هەمیشە خوێناوییە» لە ڕێگەدا گوێی لە هاواری کەسێك بوو، لە گەڕەکێکی تاریکدا، بەخێرایی بەرەو ڕووی دەنگەکە ڕۆیشت، تا بەهانایەوە بچێت.. بینی کەسێك زۆر بەسەختی بریندارەو بە چەقۆ لێی دراوە، خوێن لە لاشەیەوە جۆگەلەی بەستبوو.. چەقۆکەش لەلاشەیدا، جێ مابوو، بەپەلە چەقۆکەی لە جەستەی بریندارەکە هەڵکێشا، هەوڵێ دا هەڵی بگرێتو یارمەتی بدات، تا بیگەیەنێتە لای پزیشکێك، بەڵام بەداخەوە، بریندارەکە بە دەستییەوە گیانی لەدەست دا، تەواوی جلەکانی، خەڵتانی خوێنی بریندارەکە بووبوو، خەڵکی گەڕەکیش، بەرەو دەنگەکە چوون، کاتێك بینیان قەصابەکە، گیانی شەڵاڵی خوێن بووەو چەقۆیەکیشی بەدەستەوەیەو پیاوەکەش گیانی سپاردووەو وەکو جۆگەلە، لە شوێن چەقۆکانییەوە، خوێن فوارەی دەکرد.. دەستبەجێ هەمووان، بە یەك دەنگ قەصابەکەیان تۆمەتبار کرد، هەرچەندە قەصابەکە بەرگری لە خۆی کردو ویستی خەڵکەکە تێ بگەیەنێت، کە ئەو بکوژی ئەو کەسە نییەو ویستویەتی هاوکاری بکات، بەڵام هاوارو پاڕانەوەکانی بێسوود بوون، چونکە هەموو بەڵگەکان، لە دژی ئەو بوون، هەر لەبەرئەوە، قەصابەکە تەسلیمی دادگا کراو دواجاریش بڕیاری لە سێدارەدانی بۆدەرچوو، کاتێك بردیان بۆ بەردەمی پەتی سێدارە، چاوەکانی هۆن هۆن فرمێسکیان هەڵدەوەراند.. ڕەنگە ئێستا منو تۆی خوێنەریش، هەستی مرۆڤانەمان، بۆ کاکی قەصاب بجووڵێتو لە ناخەوە ئاواتەخوازبین، کە دواجار، لەبەردەم پەتی سێدارەدا، ڕاستییەکان ئاشکراببنو بکوژی ڕاستەقینە دەربکەوێتو ئەم مرۆڤە بێتاوانە، ڕزگاری ببێت..

کەواتە با پێش ئەوەی بە سۆزو میهرەبانیمان، ئاوات بخوازین، با پێکەوە سەرەنجامی ئەم چیرۆکە، بخوێنینەوەو بزانین، دادپەروەریی ئەم کارە لە کوێدایە!! ئاخۆ ئەم مرۆڤە،



سەرەرای پیاوەتیو مەردایەتی، ئایا شایەنی ئەوەیە، ملی بکرێت بە پەتی سێدارەدا؟ یاخود لەم نێوەندەدا، نهێنییەکی دیکە هەیەو هێشتا ئێمەو ئامادەبووانی دادگاییەکە، نایزانین؟؟

ساتەکان تێدەپەڕین، هەنگاوەکان هێواش لە پەتی سێدارە، نزیك دەبوونەوە، کەسانێك بۆی دەگریانو دڵیان بۆ بێتاوانیی ئەم مرۆڤە دەسووتاو کەسانێکیش، چاوەڕێبوون تۆڵەی خوێنی کوژراوەکەیان، بەچاوی خۆیان ببینن، چونکە کەسوکاری کوژراوەکە، لایان وابوو، تەنها قەصابەکە، بکوژی ڕۆڵەکەیانە!

لەو ساتەدا، کە قەصابەکە دڵنیابوو، پەتی سێدارە ڕەحمی پێناکاتو دوای چەند ساتێکی دیکە، بۆ دواجار، ماڵاوایی لە ژیان دەکات!!

ئیدی، ویستی ئەو نهێنییە بدرکێنێت، کە بیست ساڵە ئازاری ویژدانی دەداتو ئاسوودەییو بەختەوەری لێ تێکداوە.. قەصابەکە، لە دوا وتەکانی ژیانیدا، هاواری کردو گوتی: خەڵکینە! سوێند بە خودا، من ئەم کەسەم نەکوشتووە، کە ئێستا لەسەری، لە سێدارە دەدرێم.. لە ڕاستیدا من بکوژی کەسێکی دیکەم، کە بیست ساڵی ڕەبەقە، ئەو نهێنییەم شاردۆتەوەو لای هیچ کەس نەم درکاندووە، دڵنیام، کە لە تۆڵەی خوێنی ئەو مرۆڤە بێتاوانەدا، ئێستا من لە سێدارە دەدرێم، پاشان وتی: پێش بیست ساڵ لەمەوبەر، من گەنجێکی تازەپێگەیشتوو بووم، بژێویی ژیانم، بە هۆی گواستنەوەی سەرنشینەوە بوو، لە ڕێگەی بەلەمێکەوە، لەمبەری ڕووبار، بۆ ئەوبەری ڕووبار، ڕۆژێکیان کچێکی دەوڵەمەند، لەگەڵ دایکیدا هاتن بۆ ڕۆخی ڕووبارەکەو داوایان کرد، بیانبەم بۆ ئەوبەری ڕووبارەکە، منیش گواستمنەوە بۆ ئەوبەری ڕووبارەکە.

ڕۆژی دواتر، گەڕانەوە.. منیش گەیاندمنەوە ئەمبەری ڕووبارەکە، لەگەڵ تێپەڕینی ڕۆژگار، دڵم وابەستەبوو بەو کیژە دەوڵەمەندەوە، دوای ئەوەی ناونیشانیانم پەیداکرد، چووم بۆ لای باوکی کچەکەو بە فەرمی خوازبێنیم لێکرد، بەڵام باوکی ڕازی نەبوو، چونکە من کەسێکی هەژاربوومو ئەوانیش دەوڵەمەندن!!

دوای ئەوە، ماوەی دوو ساڵ ئەوانم نەبینییەوە، نەخۆیو نە دایکی.. بەڵام لە ناخەوە، دڵم هەر لەلای بوو..

ڕۆژێکیان، من لەناو بەلەمەکەمدا بووم، چاوەڕوانی سەرنشینم دەکرد، بینیم ئافرەتێكو منداڵەکەی، هاتن بەرەو ڕووەو داوایان لێکردم، کە بیانگوێزمەوە بۆ ئەوبەری ڕووبارەکە.

کاتێك بەڕێکەوتین، گەیشتینە ناوەڕاستی ڕووبار، دیقەتم دا؛ ئەم ئافرەتە، هەر ئەو کچەیە، کە خوازبێنیم کردو باوکی ڕازی نەبوو، هاوسەرگیریم لەگەڵدا بکات. ئیدی بە بینینی زۆر خۆشحاڵبووم. سەرەتا، دەستم کرد بە باسکردنی خۆشەویستیو ئەویندارییش، بەڵام ئەو زۆر بە ئەدەبەوە، قسەی کردو وتی: کە من هاوسەرگیریم کردووەو ئەوەش منداڵەکەمە!

بەڵام من لە ناخەوە، ئاگرم بۆی گرتبوو، نەمدەتوانی، ئەم هەلە لە دەست خۆم بدەم.. لێی نزیکبوومەوە، هاواری کرد بەسەرمداو وتی: لە خودا بترسە ئەی لاو!

بەڵام هیچ لەوانە کاری تێنەکردم، ئەو داماوە، سەرەتا تا توانی بەرگری لە خۆیو منداڵەکەی کرد، منداڵەکەی لە ترسا دەیقیژاندو فرمێسکی، وەك بارانی پەڵە هەڵدەوەراند.. منیش منداڵەکەیم لێسەندو لە ئاوەکە نزیکم کردەوەو پێم وت: ئەگەر خۆت بەدەستەوە نەدەیت، منداڵەکەت دەخەمە ناو ئاوەکەوە، زۆر گریا، زۆر پاڕایەوە، بەڵام هیچ گوێم بە لاڵانەوەو پاڕانەوەو فرمێسکەکانی نەدا! منداڵەکەم لە ئاوەکە نزیك کردەوە، تا تەواو نزیکبوو لە مەرگ، ئەو پاڵەوانە ڕەوشتبەرزە، سەیری دەکردو وەکو باران فرمێسکی دەڕشت، بەڵام ئامادە نەبوو، داواکارییە شەیتانییەکەی من جێبەجێ بکاتو هیچ وەڵامێکی نەدامەوە. دووبارە، سەری منداڵەکەیم، لە ئاوەکەدا نقووم کردەوە، ئەمجارەیان زیاتر لە ئاوەکەدا هێشتمەوە، تا ئەو ساتەی قاچو دەستی لێکئاڵانو بە تەواوی لە جووڵە کەوتو گیانی سپارد.. دواتر لاشەکەیم فڕێ دایە ناو ئاوەکەوە.. بەڵام ئەو پاڵەوانە، لێوانلێو لە ئاکاری بەرزو شەرەفبەرزی، ئامادەنەبوو تەنانەت سەیریشم بکات!

ئنجا بەرەو ڕووی خۆی ڕۆیشتم، بەڵام بە هەموو توانایەوە، ڕووبەڕووم بووەوە، منیش قژیم ڕاکێشاو ئەویشم لە ئاوەکە نزیك کردەوە، سەریم لە ئاوەکەدا نقووم کرد، دەرم هێنایەوە، بەو هیوایەی شیرینی ڕۆح، ناچاری بکات خۆی بەدەستەوە بدات.. کاتێك دەستەکانم ماندووبوون، دووبارە سەریم لە ئاوەکە هەڵکێشا.. سەرەنجام ئەویش وەکو کۆرپەکەی لە جووڵەکەوتو گیانی سپارد.. ناچار بووم، لاشەی ئەویش فڕێ بدەمە ناو ئاوەکەوە!!

پاشان گەڕامەوە.. خۆشبەختانە، یەك کەس بە تاوانەکەمی نەزانیو منیش، تا ئەم ساتە، لای هیچ کەس ئەو تاوانەم باس نەکردووە!

بەڵام بێ ئاگابووم لەوەی، خودا هەر ڕۆژێك بێت، تۆڵەی ئەو تاوانە نەگریسەم لێ دەسەنێت.. بەبیستنی ئەم تاوانە، ئامادەبووان هەمووان دەستیان بەگریان کرد.. پاشان فەرمان دراو لە سێدارەیان دا..

سڵاو لەو پاڵەوانەی گیانی خۆیو کۆرپەکەی، لە پێناوی بەرزراگرتنی شەرەفی بەرزو ئاکاری جوانو ڕەوشتە پاکەکەی بەخشی.. ئەگەرچی ئەو پاڵەوانانە، گیانیان بەخشیوە، بەڵام ناوو ژیانیان بۆ هەمیشە زیندووەو نەوە لە دوای نەوە، وەکو نموونەی بەرزی فیداکاریو ڕەوشتبەرزیی، دەگێڕدرێنەوە.. بەو هیوایەی کەسانی دوای خۆیان، سوود لە هەڵوێستی بەرزییان وەربگرن!

خۆشەویستان، سەرنج بدەنو ڕابمێنن، ئەم پاڵەوانە، بە مەرگی خۆیو کۆرپەکەی ڕازی بوو، بەڵام بە شکاندنی شەرەفی ڕازی نەبوو.. ئەی دەبێت ئەو هەڵوێستە جوامێرانە، چییان بەسەرهاتبێت؟؟ لەگەڵ ڕێزو حورمەتی زۆرمان، بۆ هاووێنەکانی ئەو پاڵەوانانە، بەڵام هێشتا ئافرەتانێك هەن، بە قسەی باقو بریقەداری تەلەفۆنێك، دیارییەکی بێنرخ، درۆیەکی شاخدار، پیلانێکی سادەو ساکار، دەبن بە نێچیری چەوری گورگە برسییەکانو دواتریش، تا دواهەناسەی ژیانیان، پەنجەی پەشیمانی دەگەزنو پەشیمانیش دادیان نادات.. هیوام وایە، ببینە نموونەیەکی جوان، بۆ خۆمانو دەوروبەرمان، پەند لە ژیانی ئەم شێرەژنانە وەربگرین.. چونکە مرۆڤ، کاتێك شەرەفی بەرزی، لەدەست دەدات، شتێکی دیکە نامێنێتەوە، لە دەستی بدات.



لەبەر تەوقی فیراقو ئیشتیاقت فەراقی کرد، دڵم تۆقی بە زاری بە جاریٚ بمکوژە، خوێنم بڕێژە خەلاسم کە، لە دەردی ئیتیزاری -وەفایی-

# مەتڵەبی دڵ!

بێدەنگ مەبە، لە چریکەی دەنگت مەحرووومم مەکە!
لەگەڵ بێدەنگی تۆدا، ئیدی من، گوێم لە ترپەی دڵیشم نابیٚ!

ئەگەر قرچەی ناخو ڕێژنەی فرمێسکەکانم نەبن، هەست بە زیندوویی خۆشم ناکەم!

خەریکم وەکو منداڵ، جگە لە گریان، زمانێکی دی نازانم، بۆ گوزارشت لە داوای دڵم!

ئاخر من ناتوانم، بڵێم: چیم دەویٚو کێم دەویٚ!

وەکو نەی کونکونە جەرگم، لە تاو هیجرانی تۆ بۆیە بە هۆی نەی دەسووتێمو بە نەغمەی نەی دەناڵێنم
-وەفایی-

چۆن بتوانم، بڵێم: من لە تاسەی چاوەڕوانیی کەسێکدا دەسووتێم، کە بێبەرامبەر خۆشی دەوێم، بەبیٚ هیچ داوایەك، تەنها خۆشی دەوێمو بەس!

بە کیٚ بڵێم، کە ئەگەر خەیاڵو ئەندێشەی دڵ نەبیٚ، ناتوانم چرکەیەك بژیم!

ئەگەر سرووەی هەناسەت، لە بۆنی بارانا، ئاوێتەی ڕۆحم نەبا، ئێستا دەمێك بوو، نێوم لە پەڕاوی ژیانا، سڕابووەوە!

دڵ ڕۆییوە قوربان، لە وجودم بە خەیاڵات دایم لە سەفەردایە، ئەگەرچی لە حەضەردا
-تاهیر بەگی جاف-

خۆ من گلەیی، لە عەزابی ڕۆحو ئەشکەنجەی دڵ ناکەم، با بگەمە دیدارت، با چاوم بە کلی دیداری ڕوخسارت برێژم، ئیدی با ئەو ئاوازە، با هەر بەردەوام بێت!

من گازندەیەکم لە لەیلای دڵم نییە!

یَقولونَ لَیلی عَذَّبَتكَ بِحُبِّها
ألا حَبَّذا ذاكَ الحَبیبُ المُعَذِّبُ
-مجنون لیلی-

ئەمە تەنها پەیوەندیو ئالوودەبوونی مرۆڤێك نییە بە مرۆڤێکەوە! ئەمە تەنها داواکاریو تکایەکی سۆزداریو هەستێکی کاتی نییە!!

ئەوە مەتڵەبی دڵو حاجەتی ڕۆحو ئاوێتەبوونی خوێنە، لە شادەماری مەحبووبدا!

ئەوە هەناسەی زیندەگیو ئاوێزانبوونی دوو ڕۆحە، کە بێ یەکتر، دەمرنو ناژین!

ئەمە جیهانی ڕۆحەو لاشە، هیچ مەقامێکی نییە لێرەدا!

لێرەدا، مەرهەمی ڕۆح، تەنها ڕۆحەو هەتوانی دڵ بۆنی هەناسەی ئەویندارە!

سەد تەبیب هاتو عیلاجی ئەم برینانەی نەکرد
تۆ عیلاجی زەخمەکەم کە، سا بە ئامانم وەرە
گەر دەزانی، چەند پەشێوە حاڵەکەم، بۆ دیدەنت
سەد ئەوەندەی زوڵفەکانت، دڵ پەرێشانم وەرە
—تاهیربەگی جاف-

وەها ئەوینێك، هەرگیز گۆڕانی بەسەر نایەتو خۆری، هەرگیز ئاوا نابێو گوڵزاری، هەرگیز زەرد نابێو نوری، هەرگیز خامۆش نابێ.

لە دنیادا، هەموو شت، قابیلی تەغییرو گۆڕانە
بە تەنیا حوسنی تۆو عەشقی منە، نەیدیوە تەغییرێ
—کەمالی-

دڵ ناتوانێ، تاسەی عومری خۆی، بۆ کەس بدرکێنێ، جگە لە تۆ!

ڕۆح ناتوانێ، چرپەی ڕازی، بە گوێچکەی کەسدا بچرپێنێ، جگە لە تۆ!

بیناییم، تروسکەیەك بەدی ناکات، پەپوولەی خەندەیەك، لەسەر خونچەی لێوم، نانیشێتەوە!

سروەی شادییەك، خۆی ناکات بە ژوورەکەمدا!

گەر تۆ نەبی، وشەکان ماڵاواییم لێدەکەنو شیعر نایەتە دیوەخانم!

گەر تۆ نەبی، من بۆ کێ بنووسم؟!

گەر تۆ نەبای، لە چاوەڕوانیی کێدا، ئەستێرەم دەژماردو لە تاسەی کێدا، هەناسەم تێکەڵ بە بای خەزان دەکرد؟!

تۆم نەبای، من چاوەڕێی کێم کردبا، تا چیرۆکی تەمەنمی بۆ بگێڕمەوە؟!

ئەم عومرە عەزیزە، کە لە بۆت، نەقدو دراوە
سەد حەیفو درێغا، کە موسوڵمانی نەماوە
عومرێکی درێژە، بە خەیاڵی سەری زوڵفت
سەوداو پەرێشانمو سەودایەکی خاوە
—نالی-

دەزانم، ئەم هەستەی من، دڵۆپێکە لە دەریای بێبنی هەستو نەستی بێسنوورت!

دەزانم، دەترسێی!

لە لێدانی دڵ، دەترسێی...

دەترسێی، ئیدی نەتوانێ، چاوەڕێ بکات...

دەترسێی..... لە لێوەکانت دەترسێی!

دەترسێی، چیدی نەتوانێ، ڕازی ئەوین، بشارێتەوە!

دەترسێی، ئیدی گوێچکەکانت، لەدەست بدەی، چونکە ئەگەر چرپەی نازی نازداری دڵی، پێ نەژنەفی، ئیدی وتەیەکی دی، نابیسی!

سەیرە، گیانی من سەیرە! لە دنیایەکدا، جێمان نابێتەوە، کە جێگای هەزاران هەزار کەسی تێدا دەبێتەوە!

لەو ڕۆژەوە تۆم ناسی، ئیدی نەمتوانی، جگە لە دڵی تۆ، لە هیچ شوێنێکدا ئۆقرە بگرم!

چاوەکەم، کەی بێ زەمانێ، زوو بە زوو
دابنیشین بێ غەمی دڵ، دوو بە دوو
دەفتەری ڕازی گلەی ڕۆژی فیراق
بێتە مەیدانی بەیانۆ، موو بە موو
چەندە خۆشە، بۆ منو تۆ پێکەوە
وەك گوڵو بولبول، بەشێوەی ڕووبەڕوو
—ناری-

ئارام بگرە، شازادەکەم، وادەی لیقا نزیکە......

ژووانی ڕۆح، بە چرای ئەوین ڕووناکەو ئینتیزاری وەسڵی یارو قدومی ئیمپراتۆری دڵە!

هەموو شەوێك، بە خەیاڵی ئاوازی تەشریفی تۆوە، خەو دەچێتە چاوەکانم!

لە گوێما دەنگی دەقولبابی دڵ دێ
خەیاڵی یارەکەم، میوانە ئەمشەو
—سالم-

گەرمیانی



# نامە نورییەکان

## نامەی سی و چوار

بەندەیەك خامە بكاتە باوەشی قامكە چكۆلەكانیو بیەوێ سەبارەت بە حەمدوسەناو وەسفی خودایەك بنووسێ كە خاوەنی ناوی زێدەجوانو سیفاتی بێ سنوور بەرز بێت، زۆر ئەستەمو دژوارە...

ڕەحمەتی خودا لە موتەنەبی شاعیر كە دەفەرموێت:

وأمَا وحَقّكَ وهْوَ غايَةُ مُقْسِمٍ
لَلْحَقُّ أنتَ وما سِواكَ الباطِلُ
ما دارَ في الحَنَكِ اللِّسانُ وقَلَّبَتْ
قَلَماً بأحْسَنَ مِنْ ثَنَاكَ أنامِلُ

ستایشی خواوەند، باسكردنی پەروەردگاری مەزنو هەڵبژاردنی وتەگەلێك بۆ وەسفی عەللامولغیوب بە من چۆن دەكرێت!؟

سوێند بە زاتی خودا ئەو كاتەی دەمەوێت وەها كارێك بكەم، بەرامبەر بە ﴿ هُوَ ٱللَّهُ ﴾ تەزوو بە ڕۆحمدا دێتو زمانم لاڵ دەبێت، خۆئەگەر خودای گەورە هیچ وەسفێكی دیكەی زاتی شەریفی خۆی نەكردباو تەنها فەرمووبای (هو الله) بەس بوو بۆ كەسێك بزانێت ﴿ هُوَ ٱللَّهُ ﴾ مانای چییە!

ئەو كاتەش دەچیتە خزمەت ﴿ هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِى لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ﴾ الحشر: ٢٣ بۆ گەورەیی مەلیكولملوك بۆ ڕاگری ئاسمانو ڕاخەری زەوی، بۆ بەدیهێنەری بوونەوەر، بۆ شای دونیاو ئاخیرەت، بۆ ڕۆزیدەری هەموو مەخلوقات!!

بەرامبەر میهرو بەخشندەییو گەورەییو دەسەڵاتی بێسنووری من چی بڵێم!؟

بۆ خودایەك كە جگە لە ئەو ئیدی خودایەك نییە شایانی پەرستن بێتو دەبێت بە چی زمانێ سەنای ئەسمائی حوسناو سیفاتی عولیای بكەین!؟

خودایەك كە جوانو جوانویستو نێوەكانیشی لەوپەڕی جوانیدابن چی بڵێین لە وەسفیدا!؟

خودایەك كە لە بەرزی سیفاتو بڵندی مەقامو مەكانو هێزو دەسەڵاتو عیلمو توانای كەسی نەگاتێ!

بە چی وەسفێك وەسفی بكەین! ئێمە ناتوانین هیچ بڵێین، تەنها دەتوانین لە ڕێگای وەسفی خوداوەند خۆی لە قورئانداو پێغەمبەریش لە فەرموودە شەریفەكانیدا وەسفی بكەینو خودای گەورە بە هەموو ئەو وەسفانە وەسف بكەین كە لە قورئاندا وەسفی خۆی پێ كردوون، یاخود پەیامبەر (سڵاوی خودای لێبێت) لە فەرموودەكانیدا وەسفی پێ كردوون!

چونكە هیچ ڕێگایەك نییە بۆ گەیشتن بە خوداو وەسفی زاتی ئیلاهی جگە لە وەحی خودایی كە ئەویش قورئانو سوننەتە!

ئێمە دەبێت دوای سەلماندنی تەوحیدی ڕوبوبییەتو ئولوهییەت دەبێت ئیقراری تەوحیدی ئەسماءو سیفات بكەیت، بەو شێوەیەی كە خودای گەورە وەسف كراوە لە قورئانو سوننەتی سەحیحدا!

بێئەوەی پرسیار لە كەیفییەت بكەین، یا تەمسیلی بكەینو بە شتێكی بشوبهێنین، یا تەئویلی بكەینو تەحریفی ماناكانی بكەین!

﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ﴾ الشورى/ ١١

ئازیزم ئەمە ئەو ئایەتەیە كە بۆ یەكەمین جار زمانم پێی پژا، یەكەمین ئایەتی قورئانە كە باوكم فێری كردمو لەو ڕۆژەوە هەم خۆشەویستی قورئانو هەم خۆشەویستی ئەسماو سیفاتی خودا لە نێو دڵمدا چەسپا!

ئەوكات مانای ئەم ئایەتەم نەدەزانی، تەنها بە هەستی پاكی منداڵانەو فیترەتی خوداییەوە دووبارەم دەكردەوە تا لە بەرم كرد، ئەو كات تازە پێم گرتبوو، یەك دوو ساڵان بووم هێشتا زمانی گفتوگۆم تەواو پاك نەبووبۆوە، وەلێ دواتر هەموو تەمەنم بەخشی بە فێربوونو تێگەیشتن لە بیروباوەڕی ڕاستەقینەی ئیسلامو ئاشنابوون بە ناوو سیفاتی ئیلاهی!

هێشتا هەر وا دەزانم منداڵە چكۆلانەكەی دوێنێمو تازە بۆ یەكەم جار ئەم ئایەتە پیرۆزە دەخوێنمەوە!

﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ﴾ الشورى/ ١١

ئاخر بەرامبەر خودایەك كە هیچ نموونەو هاوشێوەیەكی نییەو بیسەرو بینەری ڕەهایە، من چیمو چی دەزانمو دەتوانم چی بڵێم؟!

لە یەكی ناوەندیش بووم، كاتێك لە ژوورەكەمدا بە خەتی فارسی لە سەرسەری خۆمەوە ئایەتی:

﴿ٱلرَّحْمَـٰنُ عَلَى ٱلْعَرْشِ ٱسْتَوَىٰ﴾م هەڵواسیبوو!!!

مەلایەك كە ئەوەی بینی گوتی: لەم هەموو ئایەتە بۆچی ئەم ئایەتەت هەڵواسیوە، دەزانی چی هەراو بەزمو كێشەیەكی لە سەرە!!

من ئەو كات هیچم لە جیاوازیو ململانێی پێڕو فیرەقە كەلامییەكان نەدەزانیو نەمدەزانی كە ئەوان سەبارەت بە عەرشو علوی خودا چەندە ناكۆكو ناتەبان! بەڵام لە ناخی دڵمەوە باوەڕم بە بەرزیو بڵندیو ئیستیوای خوداوەند هەبوو، ئێستاش كە پسپۆڕی عەقیدەو فیرەقی ئیسلامیم هەر هەمان باوەڕی جارانم هەیەو دڵنیام گرتنەبەری تەئویلو تەحریف جگە لە سەرلێشێوانو مەحرووم بوون لە چێژو حەلاوەتی ئیمان بە ئەسماءو سیفاتو ئاشنانەبوون بە گەورەییو عەزەمەتی خودایی هیچی دی نییە!

﴿فَتَعَـٰلَى ٱللَّهُ ٱلْمَلِكُ ٱلْحَقُّ ۖ لَآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْكَرِيمِ﴾ المؤمنون/ ١١٦

خودا زۆر لەوە گەورەترە كە زاتو ئەسماءو سیفاتی بچێتە ژێر ڕكێفی عەقڵی بچووكی ئەهلی كەلام!

جا هەر كەسێك دەیەوێت بە ڕاستو دروستیو زۆر بە سانایيو بەبێ گرێ لەگەڵ ئەسماءو سیفاتی خودادا بژیو لە ژیاندا شوێنەوارەكانی ببینێ، ڕاستەوخۆ تەماشای قورئان بكات، یا ڕاستەوخۆ فەرموودەكانی پێغەمبەر (سڵاوی خودای لێبێت) لە سەحیحەیندا بخوێنێتەوە، بە تایبەت كتێبی (التوحید)ی سەحیحی ئیمامی بوخاری!

هەموو ئەو پەڕاوانەش كە ئەهلی سوننەتو جەماعەت نووسیویانن لە تەوحیدی ئەسماءو سیفاتدا، تەنها لەو دوو سەرچاوەیە وەرگیراون، لەوێشدا باوەڕدار گەورەییو تواناو دەسەڵاتو كەماڵو جەلالو جەمالی خودا دڵو دەروونی داگیر دەكاتو لەگەڵ بیستنی ناوو سیفاتی خوداوەند، وەك بیی ناو ئاو دەلەرزێ، بەرامبەر بە گەورەیی ئەو خودایە ئیدی چاوی گەورەیەكی دی نابینێ!

وإنّي لَتَعْرُوني لِذِكْراكَ رِعْدَةٌ كما انْتَفَضَ العُصْفور بَلَّلَهُ القَطْرُ

ع. ش. شێركۆ

# لەگەڵ شەریفی شاعیردا




دڵم تەنگە، پەرێشانم دەمێکە
خەیاڵم هەردەمێ، لانەی خەمێکە
ئەوەندە دڵپڕم، پێمخۆشە بگریم
کە فرمێسکو هەناسەش، مەرهەمێکە

**شەریف..** خەڵکی شاری سنەیە لە کوردستانی ڕۆژهەڵات، خاوەنی دیوانە شیعرێکە بە نێوی (ملوانکەی شین)، کە کۆمەڵێك شیعری ناسکو جوانی لەخۆگرتووە، هێمن موکریانی شاعیر پێشەکی بۆ نووسیوە، تا ئێستاش سێ جار چاپکراوە، بەڵام بەداخەوە لە هیچ کام لەو چاپانەدا، ئاماژە بە هیچ زانیارییەك، لەبارەی شاعیرەوە نەکراوەو دواجاریش کە لە ساڵی ٢٠١٣دا بڵاوکراوەتەوە، هیچ زیادکردنێکی لەسەر چاپەکانی دی، تێدا نییەو جگە لە ناوی شاعیر (شەریف حسێن پەناهی) ئاماژەی بە هیچ شتێکی دی، نەکردووە، دوای ماندووبوونو گەڕانێکی زۆریش لە تۆڕی جاڵجاڵۆکەی ئینتەرنێتیشدا، هیچم دەست نەکەوت.

## کۆچ

کۆچی کوردان، وا بە کاروان، دێ لە ڕێی شارانەوە
ڕۆژ بە باری قورسو برسی، شەو لەبەر بارانەوە
نیشتمانی خۆمە دەیپێوم، پێم دەڵێن ئاوارەیە
گەرچی بێرەشماڵو پێخواس، سەر بە کۆسارانەوە
ڕێگە دوورو خێڵ ماندوو، لێو بەبارو پێ پەتی
چاو بە ئەسرین، دێنە پیری کۆچەکەی یارانەوە
نایە سۆزی دەنگی گۆرانی، هەوارەو کۆچی سوور
کاروان گوێی داوە، بە ناڵەی بریندارانەوە
بۆ منالێ تەرمی دایکی خۆی بەجێ دێڵێو دەچێ
ئاسمان دەگری، مەلان دەگرین بەسەر دارانەوە
دەنگی تۆپو تیری دوژمن دێ، لە شوێنی کۆچەوە
جێ هەواران، وا بە دەستی سووری زۆردارانەوە

## خوداتان لەگەڵ

کەوتووەتە بەرم ڕێگای غەریبی
گەلی ڕەفیقان! خوداتان لەگەڵ
هەرکەس ڕێگایێ بووەتە نەسیبی
گەلی ڕەفیقان! خوداتان لەگەڵ
کۆترانی زۆر لە شوێنی دانە
هێشتوویانە جێ کونجی هێلانە
زۆر کەسێ ڕۆیشت پاشان بێتەوە
بەڵام نەیدی کەس بگەڕێتەوە
کێ چاك دەزانێ چی دەکا گەردوون
یەکێ سەرکەوتوو، یەکێ سەرنگوون
دڵی گرتووم خەم وەکو دووکەڵ
گەلی ڕەفیقان! خوداتان لەگەڵ